# تێڕوانینێک لە قوتبەوە بۆ هونەری شێوەکاری کوردی

ناوی کتێب: تێڕوانینێک لە قوتبەوە بۆ هونەری شێوەکاری کوردی
نووسینی: ئاشتی گەرمیانی
ئامادەکردنی بۆ سەر ئینتەرنێت: خودی نووسەر بەهاریکاری سایتی 'پەڕتووک'
ساڵی بڵاوکردنەوە: 2007

پێشەکی؛

بۆ خزمەت کردنی کەلتوورو هونەری کوردی...... پەیامێک

ئاشتی گەرمیانی....هۆلەندا
20.05.2007 رۆژنــــــــــــــدال

مامۆستاکەم وای فێر کردم.. پیتێک و وێنەیەک و هێلکاری یەک و ووشەیەکی کوردی هەموو رۆژێک بە تۆزی تەباشیرێک لە مێشکمدا بنوسمەوە..ئا لەو کاتەوە من شەیدای هونەرەکەی بووم . 1981 لە کەرکووکەوە بۆ سلێمانی پەیمانگای هونەرەجوانەکان تا هونەر چرۆی کردو بالای دەرکرد بووم بە دەروێشی ئەو هونەرەو رێگای مامۆستاکەم بەرنەدا .

سالانێکی درێژە خەونە کۆنە هونەری یەکە لە خەونمدایە تۆ بلێ ی کەسێک دەستمان بگرێت بۆ خاتری هونەرئەم پەرانە ریز بکات و تێروانینێک بۆ هونەر دروست بکەین.. من رۆژانە وەکو جۆرنالیستە شێتەکە لە کون و قوشبنی ئەم دونیایە بەدووی هونەرمەندەکاندا دەگەرێم و لییان دەپرسمەوە بۆ ئەوەی لەدوو توێ ی پەرتوکێکدا جێیان بکەمەوە.. کەم کەس هەیە لەم دونیای چاپ و کوردستانە ئازادەدا دەستت بگرن و خزمەتت پێش کەش بکەن.. ئەوەی بینیومە تەنها لەسەر حیسابی ئەم و ئەو بووە. کوردستانی ئازاد چابخانەو دەزگای زۆرە بەلام بەداخەوە من 5 سالە هونەرم پێش کەش کردووە بۆ چاپ. چونکە بێ ڕەنگم هیچیان بۆنەکردوم.. ناحەقیان ناگرم.. دیارە هونەری مۆدرنی ئەوروپا باوی نەماوە.. بەهەر حال بۆ تێگەیشتن لەم بلاو کراوانە خزمەتێکە لەدوورو نزیکەوە بە هونەری شێوەکاری کوردی کە تا ئێستا زۆر بابەت کەمن و نی یە لەو ئەرشیفەدا.. ئەم تێروانینانە هەل قولاوی کەلتوورێکی زیندووی میللەتەکەمە لەو روانگەیەوە چاومان لە هونەری شێوەکار گرتووە.. بۆیە ئەمانە بەشێکی بچوکن لە و هونەرو گەورەیە.. هیوادارم خوێنەری هونەر سودێکی بچوکی لێ وەر بگرێت... وە ڕەخنەکانمان بە وانەیەک وەربگرێت بۆ دروست کردنی مالێکی جوانی کوردی کە هونەرەکەی دەربرین لە سامانی ئەو میللەتە بکات... من لێرەوە سوپاسی

گەورەیی بەرێز کاک بەهرۆز حەسەن دەکەم کە دیارە هەستی بە ئازاری هونەر کردووە بۆیە یارمەتی دام بۆ رێک کردنی ئەم پەرتووکە هونەری یە....

ناو: ئاشتی مەهدی مەحەمەد
ناسراو: ئاشتی گەرمیانی
ساڵی لە دایک بوون : 1965
جێگای لەدایک بوون: کەرکووک. کوردستان . عێراق
ناونیشان: Roosendaal 4708 HL Heulberg 69. Holland
تەلەفوون فاکس: 0031 (0) 165 546963
ئیمایل: a.chegani@home.nl
رۆژی ئازادی هۆلەندا 5 مایی 2005 لە شاری دەمبوش . رۆژئاوای هۆلەندا..

## خولەکان

1981-1986 پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شاری سلێمانی .کوردستانی عێراق تەواوکردوە.
1999 خوولی تەکنیکی ئۆتۆمۆبیلی لە هۆلەندا تەواو کردووە
2003 تەکنیکی ئۆتۆمۆبیلی bto 151 vw
تەکنیکی ئۆتۆمۆبیلی bto 75 وە تەکنیکی ئۆتۆمۆبیلی vw bto 15.3
سێ جار سیرتی ڤی کاتی هۆلەندی لە خوولی ئۆتۆمۆبیلی فولکس ڤاکن وەرگرتووە لە شاری لویسدم .هۆلەندا.

## چـــــالاكـــی یه هونەری یەكان

1985 یەكەم پێشانگای هونەری له شاری كەركووك .عێراق
1985 دووەم پێشانگای تایبەتی له شاری كەركووك.عێراق
1989 سێهەم پێشانگای تایبەتی له هۆلی الرەشید. بەغـدا
1990چوارەم پێشانگای تایبەتی گەلەری ئاری له هەولێر
1991 پێنجەم پێشانگای تایبەتی له قەلاچۆلان . سلێمانی
1992 شەشەم پێشانگای تایبەتی له هۆلی میدیا . هەولێر
1993 حەوتەم پێشانگای تایبەتی له هۆلی عەرەبی . دیمەشق . سوریا

## پێشانگا هاوبەشی یەكان له عێراق و سووریا

1986 هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی كەركووكی كردووە
1986 هاوبەشی پێشانگای رۆژی هونەری كردووە له بەغدا
1987 هاوبەشی پێشانگای هاوینەی گەلەری ئۆرفەلی كردووە له بەغدا
1988 هاوبەشی پێشانگای رۆژی هونەری كردووە له بەغدا و سلێمانی
1989 هاوبەشی پێشانگای الواستیی كردووە له بەغدا
1990 هاوبەشی رۆژی هونەری كرووە له بەغدا و سلێمانی
1991 هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی كوردی كردووە له گەلەری ئاری هەولێر
1992 هاوبەشی پێشانگای كردووە لەگەل هونەرمەندان فەلاح عومەرو بژار كەریم له هۆلی میدیا هەولێر
1993 هاوبەشی پێشانگای كردووە لەگەل هونەرمەندان فەلاح عومەرو غازی مەحەمەد له شاری حەلەب .سووریا
1994 هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی عێراقی كردووە له سەنتەری عەرەبی دیمەشق . سووریا
1995 هاوبەشی پێشانگای كردووە لەگەل چوار هونەرمەندی عێراقی له سەنتەری هونەری رووسی له دیمەشق
1996 هاوبەشی پێشانگای خاچی سووری كردووە له كتێبخانەی گشتی ئەسەد له دیمەشق. سووریا

## پێشانگاکان له هۆڵەندا و ئەورووپـــا

1997 بەشداری پێشانگای رۆژی پەنابەرانی له شاری ئەپل دۆرن کردووە.
1997 پێشانگای تایبەتی له بەلەدیەیی شاری بیرخن ئۆپ زۆم . هۆڵەندا.
1998 پێشانگای تایبەتی له چالاکی قوتابخانەکان ی شاری رۆزندال. هۆڵەندا.
1998 پێشانگای تایبەتی Art in Aciotn له گەلەری 10 ی شاری رۆتردام.هۆڵەندا
1998 پێشانگای هاوبەشی رێکخراوی ئایدا له شاری ئەمستردام و هۆرن و لایدن.
1999 پێشانگای هاوبەشی لەگەل هونەرمەند سووعاد ستار له زانکۆی ڤاخینیگن لــــەگەلەری جیهان له شاری ڤاخینیگن کردووە.
1999 پێشانگای تایبەتی له هۆلی بەلەدیەی ئاودنبووش بەناوی رەنگەکان لــــــــە کوردستانەوە .
1999 پێشانگای تایبەتی به 25 کاری هونەری له گەلەری واتەر تۆرن ی شاری روزندال.
1999 هاوبەشی پێشانگای رۆژی پەنهاندەکان له شاری ئەپل دۆرن .
2000 پێشانگای تایبەتی له سەنتەری کەلتووری کوردی شاری دەنهاغ.
2000 هاوبەشی پێشانگای ریکخراوی بابل لەگەل 28 هونەرمەندی عێراقی لــــــــە بەلەدیەی دەنهاغ . هۆڵەندا.
2000 هاوبەشی پێشانگای هونەری لەگەل دوو هونەرمەند هولەندی کۆری فەنهەلوف وە هونەرمەندی فەرەنسی نایلی له هۆلی نەخۆشخانەی شاری رۆزندال . هۆڵەندا
2000 هاوبەشی پێشانگای رۆژی پەناهەندەی له شاری ئەپل دۆرن کردووە .
2001 پێشانگای تایبەتی له گەلەری سولو کتێبخانەی گشتی شاری برێدا. هۆڵەندا
2001 پێشانگای هاوبەشی به ریکخستنی ریکخراوی K.I.A رۆژێک بۆ کەلتوور لـــــە شاری برێدا .هۆڵەندا.
2001 هاوبەشی پێشانگای K.I.A جێگای خالی کەلتووری شاری برێدا.هۆڵەندا.
2001 هاوبەشی پێشانگای سەنتەری کەلتووری کوردی له شاری ئەمستردام.هۆڵەندا.
2001 هاوبەشی پێشانگای رێکخراوی K.I.A له کتێبخانەی گشتی شاری ڤالڤایک.

2001 هاوبەشی پێشانگای ریکخراوی K.I.A لە هۆلی لیین باکر لە شاری بیرخن ئۆپ زووم . هۆلەندا.
2002 هاوبەشی پێشانگای ریکخراوی پەناهەندەیی لە  شاری فۆرسخوتن هۆلەندا.
2002 پێشانگای تایبەتی لە گەری واتر تۆرن لە شاری رۆزندال.
2002 پێشانگای هاوبەشی 30 هونەرمەندانیعێراقی لە شاری دەنهاغ.هۆلەندا.
2003 پێشانگای تایبەتی لە کتێبخانەی گشتی شاری رۆزندال.
2003 پێشانگای هاوبەشی ریکخراوی K.I.A لە بەلەدیەی دۆنگن . هۆلەندا.
2004 پێشانگای رێکخراوی هونەری هونەرمەندانی رۆژئاوای هۆلەندا لە شارۆچکەی واو بەلەدیەیی رۆزندال. هۆلەندا.
2004 پێشانگای تایبەتی لە هۆلی کافتریای بەرەمودا شاری کەلەمهاوت. بەلجیــکا.
2004 پێشانگای رێکخراوی ئایدا نیدەرلاند لە ئازەربایجانەوە تا دەنهاغ .لە شارەکانی
ئەمستردام و دەنهاغ و ئوترێخت.
2004 پێشانگای رێکخراوی K.I.A بۆ 5 هونەرمەندی جیا لە وولاتان
1.ئوغستوس 2004 لە بۆسنیا
2. سیپتیمبر2004 لە هیرکوفینیا
3. دیسمبر 2004 لە هۆلەندا.
2005  پرۆگرامێکی هونەری ئامادە کراو بۆ پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە شاری کەرکووک بۆ خوێندکاران خوێنرایەوە بە پیشان دانی وێنەی هونەری.
2005 بۆ رۆژنامەی باسەرە 7 بابەتی هونەی زنجیرەیی بلاوکراوەتەوە دەربارەی خەونەکان زۆر کورتن.. رۆژنامەی باسەرە لە کەرکووک. عێراق دەردەچێت.
2005 هاوبەشی پێشانگای رۆژی 5 مایی لە شاری دەنبووش بە ئامادە بوونی سەرۆک وەزیرانی هۆلەندا و شازادە کوری شای هۆلەندا ولیم الکسندەر بەشداریم کردووە.
2005 هاوبەشی پێشانگای هونەر لە شەقامی بەنکن شاری ئیتن لوور.هۆلەندا
2005 کۆمەلێک لە کاری هونەری یەک مەتر بە هەشتا وە کاری ووردیلانە بــۆ پێشانگای هاوینەی شەقامی بەنکن لە شاری ئیتن لوور ئامادە کرد.
2006 پێشانگای تایبەتی لەشاری دورن لە هۆلی رابۆ بانک
2006 پێشانگای رۆژی کەلتووری لەشاری ئێمن ی باکووری هۆلەندا.

2006 پێشانگای هاوبەشی لە شارۆچکەی واو لە باشووری هۆلەندا.
2006 هاوبەشی پێشانگای یادی رۆژی هەلەبجەو ئەنفال لە شاری دەنهاغ.
2006 پێشانگای تایبەتی لە کافتریایی بیرگشگلادباغ لە کۆلن.ئەلمانیا.
2006.2007 بلاو کردنەوەی کۆمەڵێک رەخنەی هونەری لە سایدی چراکان وچرا ی هونەری هەریەک لە سوێدو هۆلەندا.

# له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

هونەرمەندی شێوەکار: پەیمان عەبدوول

ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی ـ هۆلەندا
a.chegani@home.nl

.. ئەو خەونانەی کە دەیان وویست بمرن، جارێکی تر لە تابلۆکاندا ژیانەوە..
..هارمۆنیەتی تابلۆکان...ئاوازێکی هێواشە لەسەر دەریای بـــــاکـــوور..

....هیچ جوان نی یە بەقەدەر هەڵهاتنی ئەو هەتاوەی کە ساردەو لەناو تەم و سەرمای قوتبدا هەڵدێت...
ئەو دارستان و دارانەی کە بەرزن و وەکو منارەکەی ئیڤل لار لار وەستاون.. ئەو تابلۆیانەی کە هونەرمەندەکەی پەیمانی داوە بۆ تابلۆیەکی تر ئەو رەنگە دارانە بن کەوەک منارەکەی ئیڤل بەرز بن و جوانتر بن لە تـــۆری چاوی بینەردا، هونەرمەندی شێوەکار پەیمان عەبدوول قادر.. کە کەسێـــکە لەو ئافرەتانەی بێ وەستان یان سەرەرای سەختی ژیان و سورانەوەی چەرخی هونەری بەردەوامەو لە چوار کەنـــــارێکی تایبەتیدا رەنگ کاری دەکات و ئازارەکانی بە شێوەیەکی راستەو خۆ هێدی هێدی سارێژ ی تابلۆکانی دەکات...کەسانێک هەیە گـــوێ لە هونەرمەند دەگرن ، چاو لە تابلۆ دەگرن لەم قوتبە ساردو غوربەتی یەدا..
کەسانێکیش هەیە رێز لە هونەرەکەی هونەرمەند پەیمان دەگرن بەو هەستە مرۆڤایەتی یەی کە خـــــــۆی هەست بە ژیانێکی مرۆڤاتی دەکات، کەسانێکی تریش هەن هونەر بۆ دژایەتی کردن .. هەر ئەوەش وای کردووە کە هونەرمەند پەیمان بەردەوام بێت لە کارەکانیدا وە ئەویش هەر وەک هەموو هونەرمەنــــــــدێکی تری شێوەکاری یاساو رێگا و قوتابخانەی تایبەتی هونەری گرتۆتە بەر ..هەر هونەرمەندێک بێگومان ئەرشیف و چالاکی و دیکۆمەندی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ناساندی بە دونیای هونـــــەرو کۆمەڵگای دونیا و دەوروبەری..

کارەکانی هونەرمەندیش دیارە لەو تاقی کردنەوەیەوە سەری هەل داوە کە خاوەن ئەو تاقی کردنــەوەیەکی دیکۆمێنتاری و ئەکادیمی بووە ..تاقی کردنەوەکانی لە کاری رۆنی و ئاوی و هێلکاری تا قۆناغێکی تر وەکو گواش و ئەکریلیک..وەکو ریبازی هونەریش هەر وەک باسمان کرد ئەکادیمی و هێماخوازی تا هاوچەرخی یەتی ئەمرۆی هونەری..

هونەرمەند پەیمان وەکو ئافرەتێکی کوردو هەلگری پەیامی هونەری شێوەکـــاری کوردی هونەرەکەی کردۆتە ئەو بیرو رایەی کە باس لە نەتەوەو کێشەیەک دەکات.. دیارە ئەمەش بە هاوکاری هونەرمەندان و خودی خۆی گەورەیەکی زۆرە بۆ میللەتی کورد و پاشان بۆ هونەرەکەی.. وە ئامادە بەەنی لە نێو چالاکی هونـــــەری و بەشداری کردنی لە پێشانگاکاندا وە بەردەوام رووەوو کاری نوێ یە .. لە ئەورووپادا ئافرەتێک باس ئـــازارو مەینەتی میللەتێک دەکات بێگومان جێگای سەرەنج و تێروانینی میللەتانی ئەم نـــاوچەیەیە کە ئافرەتێکی شێوەکاری کورد دژایەتی ژیانی رامیاری دەکات بۆ هێنانە دی ئاواتـــی خۆی و میللەتەکەی،ئەو تابلۆیانەی کەخۆی خاوەن بیرۆکەو رەنگ و فۆرمێتی ئەو رەنگانەی کە لە دەروونی مرۆڤێــکەوە هەل دەقولێت بۆ رووبەری ئەو تابلۆیانەی کە خەلکانێک گوێ لە ئازارەکانی دەگرن.. وە بۆ پتەو کردنی هونــــەری شێوەکاری کوردی و ژیانەوەی ئەو خەونانەی کە دەیانویست بمرن و جارێکی تر نەگەرێنەوە بۆ ژیان...لێرەدا هونەرمەند پەیمان دەیەوێت ئەو خەون و هیوایانە وورد وورد بگەرێنێتەوە بۆ ئاکامی لەدایک بوونی ژیانەوەی خەونە مردووەکان تەکنیکی ئەو بابەتانەش لەو تاقی کردنەوانەوە سەر هەل دەدات کە خودی هونەرمەند پێیدا تێ پەر بوبێت هەر جارەی کە باس لە رەنگ دەکەین بە تایبەت تابلۆکانی هونەرمەندێک راهاتن و چاوی ئـەو هونەرمەندە هەل دەسەنگێنین لەو سروشتەی کە تەماشای دەکات و دەبینێت یان ئەوەتا چۆن دەیبینێت..

بەکام توێژی رەنگ دانەوە بە سارد یان بە گەرم بەرەش یان بە سپی یان ئەوەتـا بە چاوێکی هاوچەرخی و هێماخوازی یەوە.. بۆیە دارشتنی رەنگ پەیوەندی یەکی راستەو خۆی بە دەروونی هونەرمەندەکەوە کـــە چ شێوازێکی هەبووە..هارمۆنیەتی تابلۆکانی هونەرمەنــد پەیمان ئەو ئاوازەیە کە لەم سەر قوتبەی دەریای باکوورە فۆرمەکان لەخۆ دەگرێت..

***

## نامانەوێ ڕێزمان لێ بگرن.......

ئاشتی گەرمیانی
..هۆڵەندا..2005

دوو ساڵ پێش ئێستا واتە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق و رزگار کردنی میللەتێکی ژێر دەسەلاتی دیکتاتۆر.. هەر هونەرمەندێک بەرەو لایەک هەل هات جارێ بەرەو ئاوارەی جارێکی تر بەرەو ژیانێکی سەخت.. لە کوردستانـــدا بە نەبوونی کاروو ئاسەواری پاشماوەی هەژارێتی کە لە دیکتاتۆرەوە مابووەوە. پرۆسەی ئازادی وای کرد کە ژیـان لە شارو شارۆچکەکاندا تا رادەیەک بگۆرێت بە بوونی موچەو یارمەتی و ریزلێ نان.... بەلام ئاکامی ئەو ریـــز لێ نانە بوو بە دژایەتیەکی تەسک تر لە دونیای هونەرو کەلتووری کوریدا .. بە خۆ جیا کردنەوەو جیـــــــاکردنەوەی زۆر لە هونەرمەندان لە یەکتر وە بە گشتیش هەر یەک خۆ دۆزینەوە لە باوەشی لایەنێک و رێچکــە ی ئەو رێگایەیی کە نادیارو تاریکە وە دەر ئەنجامەکانیشی هیچ روون نی یە.. بەلام بێگومان بن مرۆڤ لـــــە دەرەوەی کوردستان ئەو رێگایە دەبینێت کە چەند سەخت و تاریک و ویران کاری یە.. وە دەزانێت هونەرمەندانــی کورد لە چ راگێژاوێکی وون بوندایە.. هەلبەست وانی کورد.. عەبدولا پەشێو.. ووتەنی لە هەر مالێـــــک ئاگردانێکیان کرد بە دوو. ئەوە راستی رووداوەکەیە.. من بێگومانیشم لەوەی کە لە کوردستان زۆر کەم کەس هەیە خۆی لە دەرەوەی ئەو بازنەیە پاراستبێت.. بەلام خۆ پاراستن لە کوردستانی دیموکراتی ئێمەدا زۆر تەمەن کورتە بەرنامەیی ریز لێ گرتن لە هونەرمەندانی کورد بەراستی بەرنامەیەکی تۆکمەو دان نانە بە مافی هونەرمەنـدی ماندوو بە تایبەت یەک سەدەیە کارەساتی سەردەمی بەسەدا هاتووە.. بەلام لەسەرەتادا زۆر هونەرمەنـــــــدی شایستەی گرتەوە وە بێگومان رێزی تەواویان لێ گرتن بەلام دوای ئەوە کارەکە رووی لە لێژی کردوو هەرچـــــی دەنگ بێژو واستە دار هەیە هەرچی هۆرە بێژو کرژوو کال هەیە هەرچی وەستاو کۆرال و چالاکی قوتابخانەکان و سەرەتایی یەکان هەیە بوون بە ئەندامی ریز لێ نان .. ئەوەی پێش پەنجا ساڵ گۆرانی هەرە لەیلێ یەکـــــەی هونەرمەندی خوا لێ خۆشبوو شەماڵ سایبی دەوتەوە ئێستا پەنجاو یەک رۆژی بۆ ژمێردراوە........

من چەند پرسیارێک لە خەیالمدا دێن و دەرۆن؟ ئایا رێز لێ نان تەنها یارمەتی مانگانەکەیە. ئایا کەرێزیان لە هونەرمەندان نا هیچ پەرەیەکی لەگەلدا نەبوو؟ ئایا ئەمە لە نەقابەی هونەرمەندان بوو بە بریار؟

یان بۆ جاری یەکەم بیرو رای چەند هونەرمەندێکی کوردستانی بوون و پاشان دەست بەسەریدا گیراو کرا بـــــە پرۆژەی ریکلامی پارتەکان.. ئەمەی دووەم راستی رێز لێ نانەکەیە... زۆر لە هونەرمەندانی کوردستـــــــــان هەر وەک لە سەرەتای بابەتەکەوە باسم کرد بە هۆی دژواری تاقی کردنەوەی کوردستان لە ژێر دەسەلاتــــــــی حوکمرانەکانی ئەمرۆدا روویان لە هەندەران کرد.. وە لەکاتی سەردانیان بۆ کوردستان تاوتویی ئەوەیان کــرد ئایا ئەوان مافی رێز لێنانیان هەیە یان نە؟ بە واستەو بێ واستە.. نەخێر.. چونکە ئێوەی هونەرمەنـــــــدان وە دانیشتووی هەندەرانن بۆتان نی یە ئەو داوایە بکەن . پتر دەربارەی ئەو بابەتە هییچ کەس زانیاری نی یـە بۆچی هونەرمەندانی کورد هەر لە دایک بوویی یەک جێگاو ئاو هەوا داوای ئەو داوایە و زۆر کارو پیـــــــشەو دامەزراندیان بکەن .. لەوە دەچێت ئەو بریارە میزاجی یە کە بەبێ هیچ بروانامەو دانیشتن بریاری لەسەر دەدرێ تەنها کاتی بێت و پەیوەندی بە وەزعی کۆبونەوە سیاسی یەکان بێت وە بەبێ هیچ بەلگەو یاداشتێـــــــــک ئەگینا چۆن وە بە چ پێوانەیەک ئەم بریارانە دەرچوە کە پەنجا سال پێش ئێستا تەنها لە تەنیشت هونەرمەند رەسوول گەردیەوە وێنەیەکی گرتووە کەچی ئەمرۆ ماقی رێز لێنانی هەیە؟؟؟؟؟؟

لە سالی 1991 بیرو رای زۆر لە هونەرمەندانی شاخ وابوو کە نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب .. بەلام لـــەوە بەدواوە شتەکان وا سەرەو خوار بونەوە کە نەک نان بۆ نانەوا ئەمرۆی 2005 بێ باوەری بە تاقی کردنـــــەوەی مێژووی هونەرمەندان و بە دەست هێنانی بروانامەکانی دەرەوەی کوردستان وە سەلیقەیی هونەرمەند یــــــــان پسپۆری لە بوارەکەیدا. بۆیە ئەمرۆ لە زۆربەی دەزگاکاندا کەسانێک بوون بە بەرێوبەر پتر سیاسیـــــــــن بەلام سیاسیش نین.. خاوەن واستەن.. واستەش نین.. لەوەی کە هونەرمەند بن یان پسپۆر بن.

لەهەر وولاتێک کارو کاروباری وولات بەرەو مادیەت و بێ پێوانەی رۆیشت بێگومان بە ئاکامەکەی وولاتێکـــــی بێ سەرو شوێن و دەبێت.. وە بێگومانیش بن کە هیچ هونەرمەندێک رازی نی یە بەوەی کە کەسێکی ناشارەزا لـــە بواری هونەردا هەلی بسەنگێن لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە.

❊❊❊

## بانگەوازێک بۆ وەزارەتی رۆشەنبیری و حکومەتی هەرێمی کوردستان

ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی ..هۆلەندا

a.chegani@hom.nl

ئەرکی وەزارەتەکەتانە.. چیتر گۆرەپانەکان دوا نەخەن لە ئاوەدان کردنەوە پسپۆری کورد لە دەرەوەی وولات زۆرن..........تەنها بریارێــــــــــــــک

کە من میوان بووم لە وولاتێک گوێم لێ نی یە چی بە سەر دێت و بەرەو کوێ دەروات.. کە من ژیــــام لە وولاتێک.. دیسان گۆهداری ئەوە ناکەم باڵەخانەو جوانی ناو شارەکەی جوانتر دەبێت یان نا....

بەلام کە دیمە سەردانی کوردستان زۆر لام گرنگە ئاوەدان و بە جوانی ببینم بە پاکـــــــی و پێـش کەوتووی بەرچاوم بکەوێت... بەخێر هاتنەکەی گەرمتر بێت.. هەر لـە پردی پەرینەوە تا دەگاتـــە کانی و ئاو جوانترو سەوز تر بێت لە چاوانی ئەو کورانەی کە لەم وولاتە رۆژگارێک بوو سنگی خۆیان کردبووە بێشکەی گولله بۆ ئازادی کوردستان، بۆیە مامۆستا شێرکۆ بێکەس دەلێت لە هەر لایەکـــەوە بروانیتە قەلا هەر قەلایە.. بە بۆچونی من بەرزی و جوانی قەلا ئەوەندە مەزنە منیش نامەوێت بەو ئاسانی یە بروانمە قەلا.. کە چۆنم بە جێ هێشتوە ئاوهاش ببینمەوە، من چووم فێری وانەی نوێ بم فێری وانەی کوردستانی نوێ بم.من شەو رۆژم لەم غوربەتە ساردە بێ هەتاوە کردۆتە یەک بۆ ئەوەی نەوەک منداڵەکانم شەو کوێر دەربچن و نەتوانن چاوە کزەکانی باپیرە لە کوردستان تیمار بکەن.. من کاتێک کوردستانم بە جێ هێشت ویستم رەنک و ئازارو تابلۆکانی بـــە ئەوروپا بگەیەنم بۆ ئەوەی ئەمرۆ بە ئاسانی لە نزیکەوە مامەلە لە گەل ئەو کەلتوورە بکەن و لێ ی تێ بگەن، من هەر جار دەلێم ئێمە دەبێت خۆمان کوردستان ئاوەدان بکەینەوە پێش هەموو کەسێک.

بەلام قەد بروا ناکەم واز لەم دەهۆل و هاوارە بهێنم کە چەندین سالە وەکو دەروێشک دوایی کەوتووم ئەویش باوەر بـــــەو بیرورایەیی کە خزمەتە بۆ کوردستان.. پێویســــتە ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆک وەزیـــران بریارێک دەربکەن بۆ هێنانەوەی ئەو دەست رەنگینانەی کە بە بەرهەم هاتووە پاش ئەو هەموو سالە غوربەتی یە.. ئەمرۆ لە هەمـــوو وەختێکی تر کوردستان پێویستیان بەو شارەزایان و پسپۆرانە هەیە بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان..

قەلای هەولێر پێویستی بە دیوار بەندی پەیکەر سازی گرنگ هەیە.. فرۆکەخانەی هەولێری نێــــو دەولەتی پێویستی بە پەیکەر سازێک هەیە..سەرۆکانی کوردستان.. بارزانی نەمرو شێغ مەحـــموودو قازی مەحەمەد پێویستیان بە مەدالیای رێزو حـــــورمەت هەیە بە مەرمەرو برۆنز... پێشمەرگەکانی رۆژگاری ئازادی کوردستان و شۆرشی گولان و داستانی پیرەمەگروون پێویستیان بە و ریلیفە پەیکەری یە هەیە کە ناوی ئاوەدان کردنەوەی کوردستانە..

رۆماو پاریس بۆچی بەناوبانگن فلۆرەنساو ئەمستردام بۆچی جێگای گەشتیارن.. چونکە جوانی داهێنان لەو شارانەدا بەدی دەکرێت ،ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری یە چیتر ئەو بەرنامانە دوا نەخـــــات کارو بەرنامەو نەخشەی پلان دانانی بۆ دابین بکات لە پال بەرنامەی شارەوانی شارەکە..ئەگەر کەرکـــووک کوردستانە و جێگای باسە؟؟؟ پێویستە هیچ نەبێت گەرەکە کوردی یەکان ئاوەدان بکەنەوە.. بێ ئەوەی چاوەروانی شتی تر بن.. هونەرمەندانی کوردستان.. ئەرکی دەزگاکانی هونەرمەندانی کوردستـــانیشە ئیدی چاوەروانی سستی نەکەن و نەخشەو پلانی جوان پێش کەشی وەزارەت بکەن بۆ دارشتن..بۆ ئەوەی کە مرۆڤ یان میوانێکی ئەورویی یان جیهانی سەردانی کوردستان دەکات بە جوانی ببینێت نەک هــەربە بێ ئاوەدان کردنەوەیی.. چیاکان سەوز ترو رێگاکان جوانتر بەنداووی گەورەتــــــــرو جوانتر..

جەنابی سەرۆک بارزانی فەرمووی ..ئێمە چەند جێگایەکی گەشتیاری ئاســـــــایمان هەیە.. لەسەری خاکی عێراقەوە مرۆڤ دێت سەردانی دەکات.. بە بۆچوونی من ئەو جێگا ئاسایـــــــی یە ئەمرۆ ئەرکی وەزارەت و نەقابە و رێکخراوە هونەری یەکانە گەورەتروفراوانتری بکەن بۆ گەشت و گـــــــــوزار..

جارێکی تر من دەگەرێمەوە بۆ تێروانینەکەم کە کێ دەبێت کوردستان ئاوەدان بکاتـــــەوە لە پەیکەرو وێنەو سیرامیک و گرافیک و بیناسازی و ئارابیسک و منارەی هونەری .. من بێگومانم لـــــــەوەی کە هونەرمەند بە تەنها هیچی پێ ناکرێت ئەگەر

دەســـت گیرۆی نەبێت بە پێچەوانەوە ئەم جۆرە کارانە پێویستیان بە کۆمپانیای گورەش هەیـــە بۆ ئەوەی نەک تەنها لە یەک جێگادا کار بکەن بەلکو ئەو ئاوەدان کردنەوەیە هەموو کوردستان بگرێتەوە.

***

## لە پێناوی هونەرێکی رەسەنی کوردی

## بۆ هەموو هونەرمەندانی شێوەکارانی کوردستان لە ئەوروپا دا

بۆ خزمەتی کەلتوورو رۆشنبیری کوردی لە ئەورووپا وە گەیاندنی دەنگی کورد بە هەمــــوو مالێک ..لەمێژەوە بیرۆکەو تاوتوی ئەوە هەبوو چ بکەین باشە..

وە لە کوێ وە دەست پێ بکەین باشە ، بریبنی چەند قۆناغێک وە دوور لەهەموو پارتایەتی و لایەنێک. فۆرمی هونەر بۆ مرۆڤایەتـــیمان کردە سومبـــلی ئەو بریارەی کە کورد دەبێت لە چوارچێوەی رێکخراوێـــکی هونەری کار بکات وەکو هەمـــوو رێکخراوە جیهانی یەکان. وە لە ئەورووپادا کارو چالاکی هونەری خۆی درێژە پێ بدات.. ئاشکرایە کە هونەرمەند نەوەستاوە وە هەریەک لەلای خۆیەوە پێشانـــگای تایبەتی و کاری تایبـــەتی یان یەک گرتنی لەگەل هونەرمەندێکی تردا کردووە.ئەوەش بۆ خزمەتی هونـــەری شێوەکاری کوردی لە هەر کوێ یەک بێت، بەلام ئەوە ئاوات و خواستی پێویستی گەلێک نەبووە. چونکە کاری یان هاوبەشی پێشانـــگاو ڤیستڤال لە رێگای پارت و رێکخراوەکانەوە کە رێکخراوێکی هونەری نین. ئەمە بۆتە هـــۆی سستی کاری هونەرمەندو نەپێکاندنی هەموو خواستەکانمان.. بۆیە پاش توێژینەوەیـــەکی زۆر لە هەلوێستی هونەری و کوردایەتی خۆمان ئەو بریارەمان داوە کە وەکو لیژنەیەک بەدوای دەنگ کۆ کردنەوە یان کۆکردنەوەی هونەرمەندانی شێوەکاری لەلیست و رێکخراوێـــــــکدا بەرجەستە بکەین، پاشان پلانی بەردەوامی

بۆ دابنێین و هیـــچ نەبێت ئال و گۆڕینێک بێتە کایەوە لە نێوان دوو کەلتووری جیاواز لە سەرخاکی ئەورووپا وە تـــــــا ئەسکەندەناڤیاش.

بۆ ئەو مەبەستەش داوا لە هەمـــوو هونەرمەندانی شێوەکارانی کورد دەکەین لە ئەورووپا و دەولەتە ئەسکەندەناڤیاکان بۆ دروست کردنی ئەو ڕێکخراوە کە دوور بێت لە دەست تێوەردانی پارت و لایەنەکان تەنها یارمەتی وپشت گیری کردنمان نەبێت بە ئیمایل یان فاکس یان بە تەلەفۆن پەیوەندیمان پێوە بکەن، جێگای سوپاس و گەورەییانە..بۆ پشت گیری کردنمان و درێژە پێ دان بـــەو خەباتە هونەری یە کــە تەواو کەری خەباتی میللەتەکەمانە.. وە بۆ ناساندنی کەلتووری کوردی بە خەلکی ئەورووپا.

ئێمەش بەردەوام لیستێک دروست دەکەین و بێگومان لە هەموو چالاکی و کارکردنێک ئاگـاداری هونەرمەندان دەکەینەوە وە ئێمەش دەبینە پردێکی خزمەت گوزاری میللەتی کورد لە ئەورووپاو سەرانسەری کوردستاندا.

پەیوەندی کردن بە ڕێکخراوی هونەرمەندانی شێوەکارانی کوردستان

ئەم خالانە ڕەچاو دەکرێت.

1. ناوی سیانی و جێگای دانیشتن و جۆری پەیوەندیمان بۆ ڕەوانە بکە
2. چالاکی هونەری هەبوو بێت.
3.بۆ پەیوەندی کردن. هونەرمەند ئاشتی گەرمیانی

NEDERLAND ASHTI heulberg 69 4708 HL Roosendaal.
TEL.0031 165 546963 Email:a.chegani@home.nl

4. هونەرمەند ئومەر ڕەسوول

Email.o.rasul@wanadoo.nl 00315914830 10

5. ڕۆژنامەی پەیامی کورد. Peyamakurd
info@peyamakurd.com

***

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

ئاشتی گەرمیانی

## هونەرمەندی شێوەکار بـــــەهادیـــــن

ـ کەنال نەما.. ڕۆژنامە نەما.. لەوسەری قوتبەوە تا ئەوسەری.. باسم نەکا تەنها ئازارەکان کۆتاییان نایەت.
ـ لە سلێمانی یەوە تانیویورک.. ڕەنگەکانم.. پەلکە زێرینەی خۆشەویستی دروست دەکەن.
ـ تەنها هونەر.. ئازارەکانم سارێژ دەکات.

ئەو هونەرمەندەی کە لاوێکی هونەری پێوە دیار بوو، فرشەیەکیش لە دەروونی هونەری سپی نابێت ئەویش بەرێز هونەرمەند بەهادینە... سالانی هەشتاکان لە سلێمانـــــــــی زوو زوو یەکترمان دەبینی، من لاوەتی ئەو لاوە چالاکە دەناسم تەنها هونەر باس و پرسیارمـان بووە وە هەر لە باوەشی هونەریشدا چاومان کردۆتەوە.. زۆر لەوانەشە هەر لەسەر هــــونەر لە یەکتر زویر ببین.. بۆیە زویر بونیش لە هونەر تازەگەری و داهێنانی بوونی ئـــــــەو هونەرمەندەیە..
هێلە ڕەشەکان و فۆرمە جیاجیاکان گۆرەپانی ئەو شەرە بوو کە بەردەوام لە هەمـــــــوو چالاکی یە هونەری یەکاندا ئامادەبوو. ئامادە بوونی بەهادیین لە بەغداو سلێمـــــانی و هەولێرئەو سوور بونە بوو کە ئەمرۆ لە هەموو وولاتەکانی ئەوروپا  تا ئەمەریکــــــاش چالاکی هونەری تیادا ئەنجام داوە. هەر ئەویشە گەلەریەکی بە ناوی ئاڤێستاوە کردۆتەوە وە زۆر کاری هونەری خۆی تیادا نمایش کردووە، ئەو مرۆڤە لە زۆر وێنەدا دەردەکـــــەوێ شەرێکی یان دژایەتیەکی گەورە بەرپا دەکات بۆ لە دایک بوونی هونەرێکی هاوچەرخ لــــە تازەگەریەکی تازەتر لە ئەمرۆی شێوەکارانی جیهاندا، یان من پێم وایە دەیەوێ لاپەرەکانی ڕێنسانس بسرێتەوە و هاوچەرخی ئەمرۆ بکات بە زنجیرەیەکی وەرچەرخانی هـــــــونـەری شێوەکاری جیهانی، بەلام هیچ کاتێکیش هێماو ڕەنگی کوردی لای ئەم هونەرمەندە نامـــــۆ نەبووە، کەم هونەرمەند هەیە سوور

بوونی هونەرییان بەردەوام بووە کاتێک لە ئەورووپـــادا گیرساونەتەوە، زۆر لە هونەرمەندان بە هۆی زەحمەتی ژیان و گوزەران وازیان لە دونیایــــی هونەر هێناوە.. بەلام هونەرمەند بەهاددین ئەو بەردەوامیەی وەگەر داوە و بەردەوامە لەسـەر کاری هونەری.. کاری شێوەکاری لای هونەرمەند ژیان و هەناسەدانی ژیانە وە بێ هونەریـــش دونیایەکی تاریکە.

زۆر بە ئاسانی مرۆڤ دەتوانێت ڕەنگە گەشەکانی ئەو هونەرمەندە بخوێنێتەوە لە ڕەنگـــــی سوورو زەردو شین وە تا ئەو ڕەنگانەی پەیوەندیان بە ڕۆژهەلاتی دەریای ناوەراست و کیشوەری ئاسیاوە هەیە وە ئەو تایبەتمەندی یەی کە لە هێل و شێوەدا دەردەکەوێت وەیان دەست نیشا ن کردنی فۆرمی لاکێشەو بازنەیی و کاری چینی ئاسا درێژ وە لا دیوارەکان.. بەلام ســـــەرای ئەوەش خۆشەویستی کارەکان وای کردووە مرۆڤ زۆر بە پیرۆزی عەشقەوە تەماشای ئەو کارانە بکات و متمانەی پێ بکات،، لە زۆر پێشانگادا کەمانچە ژەن و مۆسیقا هاودەمی هونەرمەنـدە.

ئەوەی هونەرمەند بەهاددینی ڕامالی بۆ ئەورووپا ئەو ئازارانە بوون کە کۆتاییان نەهاتـــووە وە وا بە ئاسانیش کۆتاییان نایەت، هونەرمەند بەهاددیین لە زۆر کەنال و ڕۆژنامە و گۆڤاردا چاوپێکەوتنیان لەگەلدا ئەنجام داوە وە زۆر گلەیی و گازندەیی هونەری لە کوردستان کردووە لەو کەسانەی کە تەنها بە چاوێکی بچووکەوە تەماشای هونەرمەند دەکەن و لە کورسیشـــــدا زۆر گەورەن، وە بە پەیژەش ناگەیتە لای .. وە هیچ کات ئەوانە نوێنەری کورد نابن بەقەدە ر هونەرمەندێکی کورد لە ئەورووپا یان لە کوردستان کە دەربرین لە میللەتەکەی بکات، هونەرمەند تووڕەیی ئەو جۆرە مرۆڤانەی کردووە بە خۆرسکی تابلۆکانی وە ڕەنگەکانی بۆیـــە لەوسەری قوتبەوە تا ئەوسەری تەنها ئازارەکان کۆتاییان نایەت.

ئەو ڕەنگانەی کە لە سلێمانی یەوە کۆچییان کرد بۆ ئەورووپا و ئەمەریکا پەلکە زێرینەیی خۆشەویستی هونەرمەند بەهادینە، من نازانم ئەگەر مرۆڤ چاو لە گەلەری یەکـــــــەی هونەرمەند بەهاددین بگرێت بە ڕاستی گرافیک و ڕەنـــــگ وا لە مرۆڤ دەکات کە هیچ سنورێک دانەنێت بۆ کۆتایی هاتن بە هونەرو مرۆڤایەتـــــی هونەرمەند بەهاددین... چەند باسی ئەو هونەرمەندە کرێکارە بکەم.. کۆتایی نایـــەت هەموو ئازارەکان وا دەکەن ڕێگای هونەر قوول تر بکەین وە نوێنەرایەتی هونەری کـوردی پتەو تر بکەین لە ئەمرۆی هونەری جیهانیدا.

کورتەیەک لە چالاکیەکانی هونەرمەند بـــــــەهـــاددیین

ـ 1970 لە شاری سلێمانی لە دایک بووە.
ـ1988 هاوبەشی پێشانگای مۆزەخانەی سلێمانی.
ـ1989 سەنتەری کەلتووری دهۆک.
ـ1992 هۆلی میدیای هەولێر.
ـ1994 سەنتەری کەلتووری ئیزمیر. تورکیـــا.
ـ 1995 گەلەری رۆمان.ئستەنبول.تـــورکـا.
ـ1996 شاری fueiburg ئەلمانــــــــیـا.
ـ1999 گەلەری فۆرم شاری مانهایم. ئەلمـــانیا.
ـ2000 پێشانگای هاوبەشی لە سویسرا.
ـ2001 گەلەری ئاڤێستا شاری مانهایم ئەلمانیـا .
ـ2002 گەلەری ستویودیوی ئورفیو شاری مانهایم ئەلمانیا.
ـ2003 گەلەری ئاڤێستا شاری مانهایم ئەلمانیا.
ـ2004 گەلەری مودیومی هونەری شاری شیکاغۆ وە نیویۆرک وولاتە یەیککگرتوەکانی ئەمەریکا.

***

## نامانەوێت رێزمان بگرن

**ئاشتی..هۆلەندا**

پاش 48 سالی خزمەت..مافی بە ئەندام بوونی نی یە؟؟
بە بۆچوونی ئەوان رێز لێ گرتن تەنها.. خزمەت و موچەکەیە؟؟

هەموو رۆژێک کە سەر دەخەمە سەر سەرینە کوردەواری یەکەم خەم و خەون و تەم و چیاو بەفــــــرو کارەسات دەکەمە فلیم و چیرۆکی شــــــەوانم،هەر دێمەوە بۆ کوردستان و ئاگردانی باو و باپیرمان ئەو وولاتەی کە هەموو تەمەنمان تیادا بەسەر برد و ئێسک و پروسک و لاشەمی تیادا گـــەورە بووە ئەو وولاتەی کە منیش مافی ژیانم هەیە تیایدا..بەلام هەر کات کە باسی مافێک بـــــــکەم دەیان  داربەدەست دێتە وەلام و رێگای دەنگی حەق نادەن بگـــاتە جێگای مەبەست و لە دەستەی ژێری ژێرەوە دار بەسەر بوونە،، خەونەکانی من و سەدانی وەکو من زۆرن و وە زۆر تاریک و ناخۆشن،، زەمــــەن و رۆژگار دەسووڕێتەوە کەچی هەنــــدێک کردەوەو رەفتار هەیە دەست بە دەست کورسی بـــــەکورسی  دەمێنێتەوە بۆ ئەوانی دی..
هونەرمەند.. نمونەیەکی راست گۆی کۆمەلە کــە زۆر بابەتێکی ناسک و تەمەن درێژە و هەر لەوانەوە هاوچەرخیەت و مۆدرن دێتە کایەوە..پاش یەک تەمــەن لە چاوەروانی بە یەک بوونی مالــی کوردی لە هونەروکەلتوورو ئەدەبیات..بۆیـــــــــە ئاکامی ئەو رەوشتە.. رەنگ دانەوەیەکی نەگەتیفانەی بلاوکردۆتەوە..زۆر هونەرمەندی بەتوانا لەژێر ئاگرو ئاسندا توانەوە..ئەنفال کران جەستەیـــــان تا ئێستا غەریبلی گولەیە،کەچی هیچ نە لە یـــەکێتی هونەرمەندان و کۆمەلەی هونــەرمەندان ناویان نەهێناوەتە ناو مایکرۆفۆنی باسەوە.. دوو دەزگای گەورەو دەولەمەند.. هەموو رێز لێ گرتنی هونەرمەندانیان لە چەند ناوێکدا کۆ کردۆتەوە.. هونەرمەندێکی مەزن و گەورە وەکو مەکی عەبدوولا پاش 48 سالی تەمەن و خزمەت کردنی هونەری کوردی نەبۆتە ئەندامێکی چالاک لەو دەزگایـــانە وە رێزلێنانی هونەریان پێ نەبەخشێنراوە..کام هونەرمەندی چالاک هەیە لە کوردا لەهەر کوێ یەک  بێت ئاوریان لێ نەداوەتەوە نەک ئەوەش بەلکو بە ئەندام بوونێتی زەحمەتە نەوەک پـــــــــارچە زەوی یەکی بدەنێ لەو

یان و پۆری یەی کوردستان .... چونکە ئەو هونەرمەندە لە ئەورووپا لەبەر ئەوەی چاوی شینە حکومەتەکانی ئەورووپا ســـــێ تا چوار پارچە زەوی پێ ی داوە وەکو مەکرەمەیەک بە هاتنی بۆ ئەورووپا......؟؟

رێز لێنانی ئەو کەسانەی کە لە گۆرانی یەکدا هەرە لەیلێ ی هونەرمەندی کۆچ کردوو شەمـــــال سایبیان دووبارە دەکردەوە... رێز لێ نی ئەو هونەرمەندانەی کە تەنها هێلێکیـــــان بۆ شێوەکاری کوردی نەکێشاوەلە کوردستان.. بوون بە ئەندامی بالاو گەورەترین رێزیان لێنـــــــــــــان؟؟

نان بۆ نانەوا ...هونەرمەندی راستەقینەش بۆ؟؟؟؟

رێز لێ نان بۆ چی یە و بۆ کێ یە؟..مـــن لە سالی 2003 وە 2004 سەردانی کوردستانم کردوو زۆر لە هونەرمەندانـــــم بینی وە سەردانی کۆمەلەی هونەرمەندانی کوردسنانم کرد.. وە یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان لە .. بـــە دوو ئێوارە زۆر شتی سەیرو سەمەرەم بینی لەوانە مافی رێز لێ نانیان داوە بە کەسانێک هیچ پەیوەندیان بە هونەرەوە نەبوە نە لە نزیکەوە وە نـــە لە دوورەوە..

وە هیچ پێوانەیەکیان نی یە بۆ هەلـــسەنگاندن و توێژینەوە بۆ رێز گرتن .. رێز گرتن لە چالاکی هونەری یان لە تـــــــەمەن یان لە داهێنان؟؟؟؟ من نازانم.. ئەم بابەتەی کە نوسیومە دەربرینی دووسێ هونەرمەندی تریش بوون کە یەک بۆچوونمان هەبوە،وە زۆر جار لە دانیشتنەکانماندا باسی ئەو کێشانەمان کردووە وە تاچەند دەبێت چارەسەری بکەن و باسی لێوە بکەین..بەلام رۆژگار وای لێ هاتووە کە گوێ لە کەس ناگرێت،، ئەمە جۆرێکە لە گەندەلی کە جەنابی سەرۆک بارزانی بە دوایدا دەگەرێت.. وە لەسەر فەرمووی بەرێزیان .. من باسی دەکــــــەم و بە چاووی خۆم بینیومە.. نەک من وەکو باسم کرد ئەو هونەرمەندانەش کە سەردانی کوردستانیان کردووە ئەو کەم تەرخەمی یە دەبینن،، کوا چالاکی هونەریان لەماوەی ئەو سالانەدا...؟؟

بۆیە من پێم وایە ئەم دەزگایانە دەبێت وەلامیان هەبێت.. وە روونی بکەنەوە کە لەسەر حیسابی چی رێز لە هەندێک هونەرمەند دەگرن وە باری ژیانیان باش دەکەن وە ئەواتی تر پشتگوێ دەخرێن ....ئایا رێز گرتن تەنها پارەو پوولە یان داهێنان و خزمەتی میللەت و کوردستان؟؟؟؟

***

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

ئاشتی گەرمیانی
هۆلەنـــــــدا

سەرەتا لەو دەسکە گولەوە دەست پێ دەکەم کە دەبێتە دیاری سالێک لە سەر وەر گەرانی رۆلێکی نوێ برۆژنامەگەری کوردی ئەویش تەمەنی سالێک لە پەیامی کورد بۆ هەموو مالێکی کورد و ریبوارێکی کـوردلە ئەوروپادا.. شەرەفێکی گەورەیە بۆ منی هونەرمەند کە لە رێگای هاورێ ی کاروانی هونەریـــــــــمساسان دەروێش وە گۆشەکەی خۆی یان دەنگی خۆی بکاتە دیاری من.. لاو ساسان خەباتێکی چرو پـــری هەبووە..هەر زەمانە لە رۆژنامەی برایەتی و خەبات لە هەرێمی کوردستانی عێراق کارمان کردووە بـۆلە دایک بوونی ووشەو زمانێکی پاراوی کوردی و کەلتووری کورد..خەبات بۆ دۆزی کورد.. ئەمرۆش مــن زۆر خۆشحالبووم کە پەیامی کوردیش ئەو رێزەی دا بە هونەرمەندانی کوردستان و شێوەکارانیـــــــش گۆشەیەکیان هەبێت بۆ دەربرین لە ئازارو کەم و کوریەکانیان. رەخنەو تێروانین لە ئاستێکـــــــــــی ئەکادیمی و دراسیدا بێت.. هیچ نەبێت هەولی من و کاکە ساسان و ئەندامانی پەیامی کورد چرایەکــی بچووک بۆ هونەرمەندانی کوردستان دابگرسێنێت بە تایبەت ئەو هونەرمەندانەی کە شەو رۆژیان لەبەر چرایەکی کزدا کردووە بۆ لە دایک بوونی تابلۆیەکی نۆێ و ئازارێکی نوێ، ئەو تابلۆیانەی کە هەرگیـز نامرن وە ئەو هونەرمەندانەش هەرگیز لە کارواندا لە بیر ناکرێن، پەیامی من بە شێوەیەکی هاوچەرخ چارەسەری هەندێک رەخنەیی شێوەکاری بۆ دابین کردنی بناغەیەک لە سەر ئاستی ئەوروپا و کوردستان یان پردێکی پەرینەوە بین لە نێوان کوردستان ئەوروپادا....

## هونەرمەندی شێوەکـــــار سەدرەدین کـــــاکـــەیی

1964 ________________ 2005

ـ هونەرمەندی جیهانی میرۆ.... ئەگەر بزانێت کارەکانم لەو کارانەی ئەو دەچێت ..بێگومان تەلەفونم بۆ دەکات......

ـ دەروێشی هونەر ..باشترە لە خەونە تالەکــــــــان...

ـ کورد.. لەوسەری کیشوەریش بێت .. پەیامی خۆی هەر دەگەیەنێ.....
ـ کەرکووک ....وێستگەی لە دایک بوونی خەونەکانمان بوو....
زۆر هونەرمەندی کورد هەیە ژیانێکی هاوچەرخ و نوێ خوازی دەست نیشان دەکەن بە روالەتیش رەنـــگدانەوەی هەر ئەو هونەرە دەبن..هونەرمەندی کاروانی ئەرشیفم هونەرمەندی کورد سەدرەدین کاکەیی یە کە لە کەرکووکەوە هەلقولاوە و لەوێش چاوی بە گوندی عەلی سەرایی و تاووغ و خۆرئاوای کەرکووک هەلناوە.. لە خێزانێکی هونەرمەندن وە گۆێ دەدەن بە تازەگەری و نوێ خوازی و ئارابیسک..رەنگی کوردی و کەلتووری کوردی و فەرشی کوردی بێشکەو کاسەی کۆنی کوردی.. ئەمانەو رەنگی ئەمانە ..وێنەو نەخشی ئەمانە فۆرمی ئەو هونەرمەندەیە کە بەردەوام سەرقالی ووردەکاری ئەو هونەرەیە.ژیانێکی ســــــادەو پەیوەندیەکی هونەری بەتین لەگەل هونەرمەندانی کوردا.. کاکەیی مەودای پەیوەندی زۆر درێــــــژو بەرفراوان بوو.بە تایبەت رۆژانی کەرکووکی واتە سەرەتایی سالانی 1980کان دەست پێکی شـــــەری عێراق و ئێران، ئەو کاتە قوتابی بوو لە پۆلی شەشی ئامادەیی.ئامادە بوونی لە هەموو پێشانگاکانــی بەغدا و کەرکووک و سلێمانی..وە ئامادەیی لە ناو پەرتووکخانەی کوردی و عەرەبی و جیهانــی وپـــەرەدان بەو مۆسیقاو گۆرانی یە بیانیەکان کە بەناوبانگترین گۆرانی سەردەم بوون.. ئامادەبوونی لـــــە هەموو پێشانگاکانی هونەرمەندانی کەرکووکدا وە لەگەل رۆشنبیرانی کەرکووک.
ناسینی من بە سەدرەدین کاکەیی وە دەگەرێتەوە بۆ 25 سال پێش ئەمرۆ، بۆیە وورد بونەوە بە ناخـــی هونەرمەندا بۆ من ئاسانەو زۆر بە ئاسانی هەست و تابلۆکانی دەخوێنمەوە.ئەو قوتابخانە هونەرییەیی هونەرمەند هەلی بژاردووە هەر لە سەرەتاوە بەرەو فەنتازیەت و دەرچوون لە هێل و رەنگ .زۆر جـــــار من دەگەرێمەوە بۆ کارتێکراوی هونەرمەندانی عێراقی وەک شاکر حسن السعیدو رافع ناسری کە لەبــەر گرنگی کارەکانیان زۆر قوتابی سەرەتایی هونەریان پێگەیاند و هەولیان دا روو لەو قوتابخانەیە بکە ن قوتابخانەی السعید رەگ و ریشەی دا کوتا لە پایتەختی عێراق وە بوو بە شێوازێک کە زۆر کـــــەس لاسایی دەکردەوە.بۆیە سەدرەدین لەسەرەتادا زۆر کارتێکراوی ئەو هونەرمەندە بوو پاشان خۆی لـــــە دونیایەکی تردا دۆزیەوە و هەنگاوێکی گرنگی نا بۆ وورد بونەوە لە کارە هونەریەکانی دونیای هونەرمەند میرۆ و میللیە.. لەوەش بازداوتر ئەوەیە بەستنەوەی رەنگی کوردی یە بە ناوەروەکی تابلۆکانی لەســـەر شێوازی مۆدرن .. زۆر جار هونەرمەند لە کەل و پەل و جل و بەرگدا لە

ئارایشت هەلسوو کەوتـــــــدا مۆدرن و پۆپ ئارتە.. بەلام ئەمانە نەبۆتە هۆی دوا کەوتنی لە مۆرکی کوردی کارەکانی،

سەدرەدین کاکەیی بە درێژایی خەباتی هونەری دونیایی مۆسیقاو گوێ گرتن لەمۆسیقای فەرامـــــۆش نەکردووە، لە سالانی 1999بە دواوە هونەرمەند گەیشتە وولاتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا وە لەوێ نیشتە جێ بوو  خۆیی و خێزانی ژیان خان و دوو مندالی جوانی فریشتەیی ئەریدۆزاو ئەریتۆزا...

خەونەکانی سەدرەدین شارەکانی ڤێناو ئەمستردام و پاریس بوون.. بەلام شەپۆلی غوربەت وکۆچ بەرێتــی رای کێشا بەرەو وولاتە یەککرتووەکان کە هەرگیز بەبیری کەسدا نەدەهات مرۆڤ لەو کیشوەرە لەنگـــــەر بگرێت..

گەورەترین چالاکی بە دەست هێنانی هەنگاوی گەورەیی هونەر ئەو پێشانگایە بوو کە لە ئووردن بـــــــە ئەنجامی گەیاند، لە نوسینگەیی سەفارەتی فەرەنسی ..بۆیە ئەگەر هونەرمەند میرۆ بیزانیایە کارەکـــانی سەدرەدین کاکەیی وا لە کارەکانی دەکات ئەوا تەلەفونی بۆ دەکرد..

بۆ زیاتر شارەزایی لەسەر هونەرمەندی شێوەکاری سەدرەدین کاکەیی و کارە هونەریەکانی و پەیوەندی کردن

www.sadradeenameen.com

ئەوەی کە پتر سەرەنجی راکێشاوم ئەوەیە سەرەرای سەختی و زەحمەتی و غوربەت وەپاش دە کاتژمێـــــر لە کار. سەرقالی تابلۆیەکی نوێ یە ووشەو ئازارێک لە دایک دەبێت.. سەدرەدین کاکەیی مرۆڤێکی سادە و هونەرمەندێکی پر لە تاقی کردنەوەو کوردێکی دلسۆز بۆ پەیامی گەیاندنی هونەرو مرۆڤایەتی...

ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی...هۆلەندا
a.chegani @ hom.nl

## هونەرمەندی شێوەکار مەحەمەد فەتاح

مرۆڤێکی سەرقال و پر لە بەرنامە..کاروانێکی بەردەوام بۆ درو ست کردنی پردێکی پەرینەوە لە نێوان هونەری کوردی و جیهانی دەرەوە.. مەحەمەد فەتاح ..یەکێکە لەو دەست رەنگینانەی کە بە درێژای ئەم  سالانەی دوایی چالاکی هونەری و کاری هونەری هاوچەرخ ئەنجام دەدات و پەیوەندیەکی راستەو خۆی دروست کردوە لەگەل هونەرمەندان و پلان دانانی بەردەوام لەگەل هونەرمەندان.
سالی 1985 کە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شاری سلێمانی تەواو کرد وەکو دەرچوویـــەکی ئاسایی کۆلی ئەوەی نەدا کە دوور بکەوێتەوە لە دونیای هونەری رەنگ و شێوە . بەلکو سەرەرای جەختی رامیاری کوردستان و زەحمەتی کردنەوەی پێشانگاو هاتوو چۆ لە نێوان شارەکانـــــدا بەلام بەردەوام بوونی ئەم هونەرمەندە لە دروست کردنی کارو هێنانە بەر چاوی هونەردۆستان لە هونەرو رەنگ ئەو راستی یە روون دەکاتەوە کە سەرەرای سەختی شەرو وێران کاری وولاتــی کوردستان هونەرمەندان هەر بەردەوامن بۆ بەرەو پێش چوونی کەلتوور و هونەری کـــــوردی.
سەرەتای هێل لەو هەستە ناسکەوە دەست پێ دەکات کە تۆ مرۆڤێکی کەدەتوانیت شتێکـــــــی جوان دروست بکەیت ئەو جوانی یەش دەگاتە دەم و چاو و لەشێکی لارو کۆمەلێک کوپەو پەیکەر لە رەنگ..کە هەست دەکەیت کارەکەی تۆ نوێنەری وولاتێکی بێ ناو نیشانە.. ئەو کاتە چالاکی هونەری وا دەکات مرۆڤ کون و کەلەبەر بە دوای خزمەتێکی راستەو خۆی هونەردا بگەرێت، ئەوەش لە هەموو کارو کاردانەوەی هونەرمەند مەحەمەد فەتاح دا بەدی دەکرێت، وە لەستایلی کارەکانیدا بەرچاو دەکەوێت..
مرۆڤ لە واقی ئەکادیمی یەوە کە خۆی بە تاقی کردنەوەکاندا تێ پەریوە تا دەگاتە ئاستی دەربرین خوازی و پاشان قوول بونەوە لەو بوارەدا دەگاتە ئەوەی کە تەنـها تەختایی رەنگ دەربرین لە کەلتووری وولاتێک بکات. هونەرمەند مەحەمەد فەتاح هیچ کـات دانەبراوە لەو هونەرمەندانەی کە لە شارەکەدا واتە شاری سلێمانی بۆ سازدانی

پێشانـــگای هونەری و کۆبونەوەی کۆرو  بەشداری کردن لە هونەرێکی هاوچەرخی ئەمرۆ.. وە بەشداریەکی بەردەوامی هەبوە لە پێشانگاکانی هونەرمەندانی کوردستاندا.بەلام کاتی ئەوەش هاتووە کە ئیدی هونەری شێوەکاری کوردی ئەودیوی چیاکان ببرێت و روو لە تێکەل بونێکی تر بکات لـــە دونیای هونەری مۆدرن ئەوەش بە دروست کردنی پردێکی پەرینەوە لە نێوان کوردستــــــان و ئەوروپادا.
رەنگی گەرم یان رەنگی ژیانەوە لە ژیان بە سەوز یان سەوزتر یان مۆرو پەمەیی لە هەنـــدێ جاریشدا پەنا بۆ دابەش کردنی رەنگەکان بەسەر لاشەی ئازاری مرۆڤەکاندا بۆیە هونــەرمەند مەحەمەد فەتاح توانیوێتی ئەو رەنگانە کۆ بکاتەوە وە لە چوار چێوەی ئاوات و ئازارەکانی کە دەربرینی لێوە بکات  وە دەربرینی تیادا کردووە بەو شێوە هێمایەی کە تەنها هونەری رەنـــگ پاشای هونەرەکەیەتی.. جاری واش هەیە دەم و چاوو فۆرم دەربرین لەو زەردەخەنانە دەکـــەن کە هونەرێکی کوردی رەسەنی تیادا بەرجەستە دەکرێت .. دونیای هونەرمەند مەحەمەد فەتاح
ئەرشیفێکی داچەسپاوە بۆ بونیادی هونەرێکی هاوچەرخ.

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

## هونەرمەندی شێوەکار بـــەختیار ســــوور

ئاشتی گەرمیانی...هۆلەندا
a.chegani@hom.nl

،، سروشت . و. رەنگی سروشت..لە دایک بونێکی نویٚ یە،،
ـ چیاکانی کوردستان.. فێری عەشقی رەنگی کردین.

ئەو هونەرمەندەی کە لە سالانی 1983 وە گویٚم لە دەنگی دەبوو لە چایخانەکەی گەل و چایخانەکەی ئەبو عاسی لە کەرکووک و لە مچــکۆی هەولێر و.لە پەیمانگای هونـــەرە جوانەکانی شاری سلێمانی باسیان لە هونەرمەنـــدێکی زۆر چاو بە رەنگ دەکرد..ئەویش هونەرمەنـــدی شێوەکاری کورد بەختـــیار ســــوور کە هەردەمیش باسی هونەرمەندانی کوردیان لە ئیتالیا بکردایە ناوی بەختیار سوور لەنێوانیاندا بوو.زۆر مرۆڤ کە حەزی لە سروشت دە کرد تا سالانێکی زۆر دوور هەر پەیوەستە بەو رەنگ و دونیا پر لە تاقی کردنەوەیە کە بۆچی حەز لە رەنگی سروشت دەکات. زۆر هونەرمەندی شوەکار دژی سروشتە وە حەزی لە تابلۆی شەرو وێران کــــاری و سوریالیەت و هێماخوازی و پاشماوەی شــــەر. زۆری تریش بە پیٚ ی تاقی کردنەوەکانیان بەرەو دەربرین خوازی دەرۆن..
بەلام ئەمرۆ باسی ئەو هونەرمەندە شێوەکاری یە دەکەین مامۆستا بەختیار سوور کە تا ئەم
تەمەنە هیچ کات دژی رەنگ و سروشت نەبووە، رۆژ بە رۆژ جوانی جیهان و سروشت وای لـیٚ دەکات وێنە و رەنگی سرووشت گەورەترو جوانتر بێت لە تۆری چاوانییدا.
هەر بۆیە چیاکان بە مۆرو دارستانەکان و گەلا هەلوەریوەکان بە سەمفۆنیایی رۆژگاری ژووانی وجوانی سروشت دەخوێنێتەوە، وە هەندیٚ جاریش دەگەرێتەوە بۆ ئەو

ئەکادیمیایەی کە دونیای هاوچەرخێتی تیادا دەدۆزتەوە.بە هیچ شێوەیەک لادانی هونەری تیادا بەدی ناکەیت،
هونەرمەندی شێوەکار بەختیار سوور لە زۆر گەلەری و زانکۆ و شارەکانی ئەوروپا بە کاری هونەری ئامادەی پشانگاکان بووە کە باسی لە بێ گیانی ئەو شێـــوە بەردانەی کە جوانی یەکەی لە گرتنی ئەو قەوزانەدایە.. وە رەنگ دانەوەی لە نێو ئـــاوەکەدا و جوانی رەنگ کردنی بە دەستی هونەرمەند لەلایەکی تر هەندێک بەردی تر کە ماراووین و جوانی یەکی تایبەتی داوەتە کارەکە. هونەرمەند بەختیار دەیەوێت باس لە گوی زەویەکی تر بکات کە سروشت و ئاوو هەواو بەردو خۆلی کەرەستەیەکی ترن،
هەر جار ئەگەر بپرسن چی جوانە لە دونیادا دەڵێن گوول.. دوای گوول چی جوانە..بـــــۆ وێنە کێشان. ئەو جارەش هەر گوول.. بۆیە سروشت و چاوی هونەرمەند لەو نەخش و کارانە هەلقولاوە کە پرە لە جۆرەها گولی جیا جیا ئەویش تابلۆکانی هونەرمەند بەختیار سوورە،
ئاسمانی تەم و سپی و هەور.. یان گوندی سەوزو بەهارو هەتاو.. چ تام و ئارەزویەکە بەو جوانی یە لە مێشکی هونەرمەندێکی کورد جوانی دەنەخشێنێ. من سەرســـوورماوم چونکە لە پاشماوەی کوردستانێکی هەنجن هەنجن رابکات..دەبـــێ چ تابلۆیەکبێتە ئاکام.بۆیە داهێنانەکەی هونەرمەند لەو تابلۆ جوانانەیە کە هـــەردەم هیوا بە مرۆڤ دەدات وەمێشکی مرۆڤ جۆش و خرۆش دەکات بۆ ئایندەیەکی نوێ.

بەختیار سوور
لە شاری سلێمانی کوردستانی عێراق لە دایک بووە.
1978 ئەکادیمای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردوە
1976 بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی سلێمانی کردووە
1977 پێشانگای تایبەتی گەلەری سلێمانی
1978 گەلەری ئەکادیمیای بەغدا
1981 کۆمەلەی هونەرمەندانی کورد لە ڤێنا
1983 گەلەری bisonteشاری فلۆرەنسا  ئیتاليا
1988 سەنتەری کوردی لەندەن بەریتانیا
1989 گەلەری تایبەتی شاری فلۆرەنسا ئیتاليا
تا ئێستا بەردەوامە لە پێشانگای هونەری لە ئەوروپا و ئەمەریکا

## تیشکێک بۆ کارو چالاکی هونەرمەندانی شێوەکاری

### هونەرمەندی شێوەکار فەلاح ئۆمەر

1965 لە کەرکووک لە دایک بووە
1981 -1986 پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواو کردوە.
یەکەم پێشانگای لە کەرکووک کردۆتەوە.
هاوبەشی زۆربەی پێشانگا هاوبەشەکانی هونەرمەندانی کەرکووکی کردووە
هاوبەشی زۆربەی پێشانگا گشتی یەکانی هونەرمەندانی کوردستـــــان و عێراقی کردووە.
هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی عێراقی لە دیمەشق_ سووریا کردووە.
پێشانگای تایبەتی لە وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا کردۆتەوە لە شاری ئۆهاییۆ.

..هونەرمەندی شێوەکار فەلاح ئۆمەر پاش 25 سال.. هەرچی گەلا هەلوەریوەکانە.. تاک تاک بە رەشەبا دەگەنە لام..
.. هیچ تێرم ناکات لە بۆنی تابلۆکان.. تەنها ئەو تابلۆیانە نەبێت کە دژایەتی رژێمی دەکرد لە کەرکووک.
تەنها فریایی وێنە کێشانی عەلی مەردان نەکەوتم.
... کە گەیشتمە کەناری دەریای ئۆهاییۆ.. کەشتییەکەی ئۆهاییۆ و کوردستان بە جێی هێشتم.........

کاروانی هونەری هونەرمەند فەلاح ئۆمەر ..لە سەرەتایی هەشتاکانەوە دەستی پێ کرد لەو رۆژانەی کەشەری نێوان دوو وولات هەلگیرسا شەری عێراق و ئێران.کە پاشماوەی کۆمەلێک تابلۆی سەیر سەیر بوو. لەوانە دەم و چاوە دزراوەکان و و کەلاوە وێران کراوەکان.. هەر لەم دێرانەوە من وورد دەبمەوە بۆ ژیانی هونەرمەند کە کەم جار بێ جگەرەو ئاهو خۆشەویستی یەکی خۆلەمێشی بێ سنووررو دەم و چاوێکی نەخوینراوە.. فەلاح ئۆمەر زۆر زۆر جار بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە وە زۆر جاریش زەحمەتەو دەبێ کۆمەلێک رستەی جیا جیا ی بۆ دابنێیت. کەسانێکی تریش بە سەریدا

تێ دەپەڕن ... بەلام هونەرمەند هیچ کات لە و کاروانە هونەری یـــە دا نەبراوە سەرەرای شەرو گرتن و کوشتن و ویران کاری. تابلۆکانی هونەرمەند هەردەم چاوی مندالانی کوردی پر لە رەنگ دەکرد بەتایبەت لە گەلەری کەرکووک.

1. هەر فلچەیەکی رەنگ و دە قومی جگەرە.. هەر کاسەو هەناسەیەکی ساردی نێوان تەپەی مەلا عەبدولاو گردی ئازادی وقەبرسانەکەی رێگای شۆرجە.. ئەمانە ئەو وێنانە بوون کە لە تابلۆکانی فەلاح ئۆمەردا دەتبینیەوە.. سالانێک لە سووریاو قۆناغی سەر قالی کاری هونەری شێوەکاری و رۆژنامەگەری بوو لـە بوواری کاری کاری کاتۆردا.. بەلام کاتێک مرۆڤ لە خۆرهەلاتی دەریای ناوەراست پێ هەل دەگرێـــت و بەرەو رووی ئۆقیانوسەکان دەروات نەک تەنها بیرو هۆشی بەلکو دەم و چاو و قژو کاسە سەریشـــی دەگۆرێت بە تایبەت لە وولاتێکی دووری وەکو ئەمەریکا. بۆیە فەلاح ئۆمەر زۆر کاری هونەری کێشـــا لەسەر کەرکووک و خۆشەویستی و خاک.. بەلام ئەوە ئاواتی بووە وێنەیەکی هونەرمەند عەلـــــی مەردان بکێشێ..بەو مانایەی جارێکی تر بگەرێتەوە بۆ کوردستان..

فەلاح ئۆمەر هەر هەلکەوتووی ئەو خۆشەویستی یەیە کە زەمانە لە ناو دارستانەکانی سەرچنـــــاردا بیرۆکەی تابلۆکانی سەری هەل دەدا...بەلام ئەم جارە پرە لە ئازاری جیا جیا.. مرۆڤەکان پیر بـــوون و جولەیان لاوازترە.. رەنگەکان کال بوون و بۆنی غوربەتیان لێ دێت. ئەمانە هەر هەموو نیشانـــەی ئەو کۆچەیە کە نەک هونەرمەندی گرتەوە بەلکۆ وولاتێکی رامالی..

بالیە و پشیلە چاو زاقەکەو گولە بەرۆژەکان و دارستان و رادیۆ وئۆتۆمۆبیلە چاوەروان کراوەکەو گولێک لە زستان و مرۆڤێکیش لە تابووت....... ناو نیشانی کۆمەلێک تابلۆی لە دایک بووی ئەو کاتـــە بوو کە هونەرمەند فەلاح ئۆمەر بە ئاکامی گەیاند.....لە رووی هونەری یەوە کارەکانی فەلاح ئۆمەر واقێکی رۆمانسی ئەکادیمی یە وە لە رێبازیشدا شێوەیەکی تایبەتی یە کە نمونەیی تیادا بەدی دەکرێت ئەو کاتەی هونەرمەند فەلاح گەیشتە کەناری ئۆهایۆ لەوێوە کاکلەو ناوەرووەکێکی هونەری لە دایـک بوو بۆ دروست کردنی کۆمەلێک تابلۆی نۆێ کە یەشتان نە خوێندراوەتەوە وە نەبینراوە.. باس لـــە کوردستان دەکات باس لە غوربەت و ئەو خەونانەی کە یەشتان لە دایک نەبووە.

بۆیە لەو کەنارەدا هونەرمەند چاوەروانی کەشتی یەکی خەمە بەرەو کوردستان بروات و بە یەکجاری بارگەکەی هەلبگرێت .

به داخەوە زۆر کەس لەبری تابلۆ و نان و پەرتووک گوڵلەو هاوەن و کورسیەکانی فرۆشت و ئەویش گەیشتە کەناری ئۆهائیۆ ....

دەتوانن.. هەموو شت بدزن.. لەش یان مرۆڤ کۆگا.. دەتوانن تابلۆکانی هونەرمەندیش بدزن...

بەلام خۆشەویستی فەلاح ئۆمەر و کوردستان هەرگیز نادزرێت...

***

ئازارەکان... لە ناوەڕۆکی تابلۆکان گەورەترن..

**ئاشتی گەرمیانی... هۆڵەندا**

زۆر خەون هەیە ... لە تابلۆدا جێگایان نابێتەوە .. تەنها بە ئازاری رۆژگار باسی لێوە دەکرێت .. ئەوەش ئەو خەیال و رۆژگارە کە مرۆڤ لەم سەدەیەدا لە وولاتی خۆیدا ئاوارەیە یان لە قوتبێکی تردا بێ کەسە...

ئەو تابلۆیانەی کە هونەرمەند ... خەوی تیادا بینیوە زۆریان درۆی رۆژگارن.. زۆریشیان خەونێکەو تا ئێستا نەهاتۆتە دی لەم سەردەمەدا.. زۆر پەیمانی عەشق و خۆشەویستی هەیە تەنها ماناکانی لە نێو تابلۆکاندا باسی لێوە کراوە، مرۆڤ نەی توانیوە بە راشکاوی باسی لێوە بکات.. سەردەمی راستی یان درۆ کردن لە گۆرانی و تابلۆ و شانۆدا.. کار ئەکتەری رۆژگار وای کردووە مرۆڤ لە بچووکترین شێوەدا کار ئەکتەری خۆی ببینێ.. بۆیە نرخی مانای شی کردنەوەی تابلۆ زۆر ساکارو کەن نرخە رێز لێنانی کارئەکتەری مرۆڤەکانی ووشکن و بچوکن ..

تابلۆکانمان .. ئەو کارانەی کە 100 سال پێش ئستا باسی رۆژگارێک دەکات زۆر بە بێ بایەخ پارێزراوە.. باس کردنی ئەم رۆژانەش من بێگومانم زۆر بەبێ بایەخ باسی لێوە دەکرێت و ناتوانیین بگەینە ئەوپەری ئەو خەونانەی کە خەومان تیادا بینیوە ... هەمومان ئارەزووی رۆمانسی هونەرو سوریالیەتی هونەر دەکەین.. کاتێک ئێمە ئازارەکانمان زۆر دەبن ناتوانیین ئاوها بە ئاسانی باسی لێوە بکەین بۆیە قوتابخانەی سوریالیەت دەبێتە هاورێی خەونەکانمان... زۆر لە هونەرمەندانی کورد ویستویانە ئەو دونیایە بگوازنەوە ناو کارە هونەریەکانیان بەلام بەداخەوە کێشەی وولات و میللەتێک

ئاوها بەئاسانی لا چوارچیوەی تابلۆکاندا جێگایان نابێتەوە.. زۆر جار نهێنیەکانی ناو ناخی مرۆڤ تەواوکەری تابلۆکان نیین .. تەواوکەری ئازارەکان نین .. تەواوکەری مرۆڤایەتی رووداوی رۆژگار نیین .. مۆسیقا ئاواز ئێمەی هێشتۆتەوە بۆ دروست کردنی رووداو تابلۆکان .. ئازارەکان تا دێت بە ئازار تر دەبن لەم رۆژگارە جەنجالەدا.. کە تابلۆکان رەش و سپین.. ئازارەکان بێ کۆتایین بۆیە تا دێت تابلۆکان چر ترو بە فۆرم تر دەبن ..، بە تایبەت خەونی کۆمەل                    .

***

له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

**پەیکەرە سووتـــــــاوەکــان**

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

a.chegani@hom.nl

.. له کوردستان تا ئێستاش بە پەیکەر دەلێن پت؟؟؟؟؟؟؟؟

.. ئەو پەیکەرانەی کەلە رۆژانی شەر سوتێنران.

هونەری پەیکەر سازی یەکێکە لەو هونەرە هاوچەرخانەی کە مێژوویەکی پر لە کەشکۆلی بـــۆ ئەمرۆی هاوچەرخ و تەکنەلۆجیایی بەجێ هێشتوە..چ لە مۆزەخانە جیهانی یەکان یـــــان چ لە گۆرەپان و باخچە گشتی یەکانی دونیا.. پەیکەر رووخامێکی قایمی مێژووی یە هەر ئەو کەرەستەیەشە تەمەنی درێژو مانەوەی مرۆڤایەتی پاراستوە لە هەموو جیهاندا ، گـێرانەوەی  هەموو لاپەرە مێژووییەکان و ژیان و بەرەو پێش کەوتوو خوازی زۆربەی لـەو پەیکەرانـــەدا تۆمارکراوە. بەهۆی پێش نەکەوتنی خۆرهەلاتی دەریای ناوەراست لـەو شەپۆلە تەکنەلۆجیاو مانەوەی لەژێر دەستی

دیکتاتۆرە جیا جیاکاندا ، بۆیە باری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتـــــــی لە ئاستێکی دیاری کراودا راوەستاوەو هیچ بەرەو پێش چونێکی بەخۆیەوە نەبینی هەر بۆیەش زۆر خەڵک لەلای ئێمە لە کوردستان بە پەیکەر دەڵێن پت؟ ووشەی پت لەوسەردەمەوە ماوەتەوە کە بە مانای پەرستن و ئاینی بەکار هاتووە هەر بۆیە لەسالانی 1981 وە دوای دامەزراندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە شاری سلێمانی وەچەرخاندنیکی بە خۆیەوە بینی وە یەکەم کاری هونەری لە سەرئاستی پەیکەر تاشین پەیکەری کاوەی ئاسنگەری هونەرمەندی پەیـــکەر تاش ماموستا کوسرەت جەمال بوو ، ئەمرۆ پاش 22 سال ناوی ئەهێنمەوە بیری ئەو مرۆڤانەی کە لە ژێر سێبەری پەیکەرەکەیدا باسی خۆشەویستی و وەفاداری و رامیاری کوردستانیان دەکـرد ئەو ئێوارانەی کە بوو بە ویستگەیەک و کۆبونەوەی زۆربەی ئەو لاوانەی لەگەل خۆر ئـــاوای کوردستاندا جێ ژووانیان بوو، هەر ئەو کاتەش پەیکەرەکەی کاوەی ئاسنگەر بیرو هــــــۆشی کردەوە لەلای خەلکی کوردستان. دروست بوونی پەیکەر سازو بلاو بوونەوەی پەیکەر ســـازی ئەو لاپەرانەی لەژێر چال نا کە دژی بـــەرەو پێش چوونی شارستانیەت بوون لە کوردستان و جیهاندا.

لاپەرە سووتاوەکان ئەو رۆژانە بوون کە لە پاشماوەی ئەنفال و هەڵەبجەدا بـــــە چەندەها پەیکەرو تابلۆی جیا جیا لە دایک بوون.ئـــەو پەیکەرانەی کە بی دەم و چاو بوون بەبـــێ قاچ و بە بی ئاسەوار... هونەری هێماخوازی و پەرتوو بلاوبونەوە ســەری هەل دا کە دەربرین لەو روالەتە بکات..هەندێک جاریش جۆرێک لە سوریالیەت کە بەراستی ئەو پاشماوە ویـــران کاریانەی هەر هەموو لەخۆ گرتبوو.. رەنگ دانەوەی باری رامیاری کوردستان وای کردبوو کـــە بابەتی ناوەروەکی کارەکان پتر دەم و چاوی مات و چاوەروانی و وون کردن و گەران بـــەدوای ترووسکەیەکدا مرۆڤ لە تۆری چاوی یەوە بەرجەستەیی بکات ئیستاش لە زۆر جێـــــــگای کوردستان ئەو رەنگ دانەوەیە بە ئاشکرا دەبینرێت .. تەلـی درکاوی و پۆستال و قوفـــــل و زنجیر دەرگای کوردی وێران کراو دانیشتن لەسەر چۆک وکۆترە رەش هەلگەراوەکــــــان......

بلاو بونەوەی رەنگ لەسەر تەختەی تابلۆ بەبێ هیچ نیازیک و رەنگێک.. ئەمانەو چەنـــدین بابەتی تر وێنەی روژگارێکی ترسناکداریان لە نێو ئەرشیـــفی هونەرمەندانی کوردا دروســـت کردبوو بەلام بەداخەوە تا ئێستا ئەو لاپەرانە نەپاریزراوە و وە نە توێژینەوەشی لەســــــر کراوە. لەوە دەچێت بەرەو وون بوون

بروات، پەیکەرە سووتاوەکان لە زۆر گەلەری کوردستـــان پیشان دران . لە هۆلی رەشید ی بەغداو گەلەری سلێمانی و قـەلای هەولیر ..پرش و پەلاشـی ئەو ئازارانە ئەوەندە بەهێز بوون پارچەی گەیشتۆتە ئەوپەری دەولەتەکانی ئەسکەندەنافیـا کە هونەرمەندانی کورد دەربرینی لێوە دەکەن.

***

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

## هونەرمەندی شێوەکار ووریا ســـەلاح

ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا
a.chegani@home.nl

ـ کۆچێکی درێژ...و ئازارێکی درێژ خایەن..
ـ ئازارەکانی هەلەبجە لە کیشوەری ئەمەریکادا لەنگەری گرتووە.....

زەمانە سالانێک بوو ئا وەختی ئەم سەرماو سۆلەیە.. لاوێکی چاو شینی قژ زەردم ناسی سالی 1981 لەشاری سلێمانی ، ئەمرۆ دەکاتە 25 سالی تەمەن هیواکانمان بچووک و سادە و ساکار بوون.. ئەگەر بمانزانیایە بەو هەموو رێگا سەختەدا تێپەر دەبووین پێگوومان بە کاروان و بیرکردنەوەکەمان بەرەو دونیایەکی تر دەبرد..بەلام پەشیمان نین لەو ئاکـــارەی کە وەکو ماندوویەکی درێژە ژیـــان پێ گەیشتووین، ئەویش هونەرو مرۆڤایەتی یە..
هونەرمەندی شێوەکاری کورد ووریا سەلاح ئەو مرۆڤەیە کە زەمانە گالتەو پێکەنینێکی ماندوو هەندێ پلێتە رەنگ و قوماشی ئامادەکراو..چەند هێلکاری یەکی کال کال لەبن دەستیدا بوو بـــــەرەو خوار هێدی هێدی دەکەوتینە خوار..هەوارە بەرزەو بەفر..
تا هونەرەکەی لەنگەرە پێ ی دەگرت خەون و ئاواتەکانیش گەورەترە فراوانتر دەبوون.. پاش مـاوەی دەستەپێ پەنجەی ئەو مامۆستایانەی وەکو کوردۆ حەمە عەلی و

هیوا و بـــــەختیار موستەفا و عەلی جۆلاو کۆسرەت جەمال و حیکەت هیندی و عەبدوولا رەســـوول ...هتد. بناغەیەکی هونەری بوون لەو قۆناغ و زەمەنەدا..تا تەمەنی هونـــــەرەکەمان گەورە بوو گەیشتە ئەوەی کە خۆمان چـــاوی راستی هەل بهێنین، ئەو ئاواتانە لە چوار چێوەی تابلۆکاندا تۆمار بکەین..

هەل کەندنی بناغەی هونەر لەرووح و گیانی هونەرمەنداندا ئەو قوتابخانەیە بوو کــــە لە سالانی وەکو مامۆستایان عەلی جۆلاو قادرمیرخان و ئەحمەد سالارو حیکمەت هینـــدی و دارا حەمە سەعی دا نەخشەو پلانمان بۆ دانا بوو، بۆیە هونەرمەندێکی وەکو ووریـــا ســــــەلاح ئەمرۆ ئەو دەم و چاوە بە ئازارانە وێنە دەکێشێت کە زۆر جار مرۆڤ پەی بۆ نەبردبێت،، پاشمـــــــــاوەی ئازارێکی بێ کۆتایی ئەو تابلۆیانەن درێژە بـــــەو کۆچەی کە وولاتی رۆژهەلاتی گرتەوە وەکـــــو ئێران و پاشان بەرەو پاکستان و لە شاری کوێتە مایەوە....لەوپەری ئازارەوە تا ئەو پەری...زەحمەتی ژیان..بـــیرەوەری و مالە سووتاوەکان..پەنجەداغ کراوەکان و مرۆڤە بارم تەکان.. ئەو هێلکاری و بابەتانەن تـــا قولتر بیری لێ بکەیتەوە ئەوەندە پتر تابلۆی بۆ دەکێشی،هونەرمەند وەفای خۆشەویستی هونـــەری کردۆتە  ئەو سومبیلەی کە ئەمرۆ لەوپەری کیشوەری دونیادا پەی بۆ دەبات و باسی لێوە دەکات بـــەو پەیکەرو تابلۆیانەی کە هەردەم وەکو ئادگارێک لە ئەرشیفی هونەری شێوەکاریدا دەمێنێتەوە..نەمری هونەرەکەی هونەرمەندی کورد ووریا سەلاح ئەو گەورەیی یە کە سەرەرای سەختی و زەحمەتی ژیان و فیداکاری بەردەوامی هەیە و لە لاپەرەی کلاورۆژنەی کوردیدا پتر مرۆڤ وورد تر دەبێتەوە لەو کارە هونەری بە ئازارانەی کە خۆی هەلی گرتووە و دەربرینی لێوە دەکات لە سەرتا سەری تابلۆکانیدا........ هەل هاتنی ئەو هەتاوەی کە لـە رۆژهەلاتی کوردستانەوە هەل دێت و بەرەو خوار دەروات تا کۆتای ئەورووپاو دەریای ئەتلەسی،،

نامەیەکەو لەوسەری قوتبەوە دەگاتە ئەوسەری هەر هەموو پرن لەو هاوارە کارەساتانەی کە ئەمرۆ لەو تابلۆیانەدا دەخوێنرێتەوە کە هەر شێوەیەک و مانایەکی تیادایە.. هەر گولێک و بۆنێک..هەر پەیکەرێک  و نەمرێتی یەک بۆ مێژوو وە زیندوو کردنەوەی لاپەرەکانی مێژوو.

هونەرمەندی شێوەکار ووریا سەلاح هاوبەشی شێوەکاری زۆرن وە چالاکی هونەری زۆرن هەر لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی شاری سلێمانی یەوە تا ئەمرۆش لە وولاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریـــــکا خاوەن زۆر پێشانگاو چالاکی هونـــــەری یە وە زۆر

تابلۆی جیا جیای کێشاوە لە پەیکەرو هێلکاری و کاری ئاوی و ڕەنگینی.. وە هونەرمەند هەردەم سەرقالی نەخشـــــەو پلان دانانی کاری نوێ یە..هەرچەند باسی ئەو هونەرمەندە بکەین من بێگومانم ناگەمە ناوەراستی ئازارو خەونـــــــەکان ئەو خەونانەی کە ڕەنگاو ڕەنگن و مرۆڤ وون بووە لەناوەخنیدا...............::

❊❊❊

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

## هونەرمەندی شێوەکار جەعفەر کاکەیی

**ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی**
a.chegani@home.nl

ـ تاقی کردنەوەکانی هونەرمەند لە شێوەکاریدا قوتابخانەیەکی دروست کردووە.
ـ تەنها هونەر..خەمەمان دەرەوێنێت‌وە تیمار کارییان دەکات..
ـ هونەرمەندێکی شێوەکاری کورد بەرەو بە جیهانی بوون.

هەر کەس دەم و چاوی ئەو هونەرمەندە ببینێ لە شەقامەکانی پاریس و مەدرید‌بەلێ دەزانێت لە دەریای تاوەراستەوە کۆچی کردووە بۆ ئەم کیشوەرە، بەلام دلنیاش نین لەوەی کە کوردەو بـــــە ڕەگەزی کوردستانی یە و لە خانەقینەوە کاروانە هونەری یەکەی تاو داوەو تا چاووی گەیانـدۆتە ئەوروپای سەرقال و پر لە جەنجالی و کارو هونەرو راکردن بەدوای ئەو تابلۆیانەی کەیەشتـــان لەدایک نەبوون، هونەرمەندی شێوەکاری کورد جەعفەر کاکەیی ...هونەرمەندێکی شێوەکارەو لـــە سالانی 1951 لە شاری خانەقین لە دایک بووەوە باوکی وێنەگر بووە..بۆیە باووک هانـــــدەری ئەو کورەیە کە ئەمرۆ بۆتە هونەرمەندێکی ناسراو چالاک لە ئەوروپادا، لەسالانی 1972..1976 ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی شاری بەغدای تەواو کردووە بەشی شێوەکاری.

وه له بەشی نەخشەو کارکردنی بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری بەغدا کاری کردووە،، هونەرمەند جەعفەر کاکەیی یەکێکە لەو هونەرمەندانەی کە تاقی کردنەوەو قوول بونەوەیەکی درێژی هەیــە لە نێو هونەری شێوەکاریدا..بۆیە زۆر پێشانگاو کاری هونەری گەورەیی بەدەست هێناوە ، لـــــــە پێشانگایەکەوە بۆ پێشانگایەکی نر.. لە کارێکەوە بۆ کارێکی تر..هەر لە بەغداوە تاوەکو مەدرید لە پاریسەوە بۆ رۆما و فلۆرەنسا..وە کردنەوەی پێشانگاکانی خۆی لە خۆیدا سەرکەوتوویەکـــــــی هاوتایە بۆ هونەرەکەی جەعفەر کاکەیی.

بێگومان بە لەسەرەتا هونەرمەند لە رێبازێکی ئەکادیمی و توێژەرەوە وە دەستی پێ کردووە وەکــو هەر قۆناغێک بەتەنها ئەگەر هونەرێکی خۆرسکی نەبێت..پاشات پەنا دەباتە بۆ ئەو قوتـابخانە هونەریانەی کەلەدونیادا رەچاو کراوە وە پەیوەست کراوە پـــــێ ی..لە زۆر جێگادا وەکو شـــاری مەدریدی وولاتی ئیسپانیا یەککرتنەوەیەکـــــــی تایبەتی گرتۆتەوە بۆ ئەوەی لە شێوەی گروپ و کۆمەل کاری هونەری پێش کەش بـــکەن،، بۆ نمونە سالی 1996..1997 پێشانگایەکیان لە هۆلی جوان میرۆ لە مەدرید کردۆتەوە.

ئامادەیی ئەم هونەرمەندە لە ئەوروپا ناسراوێتی یەکی گەورەی دروست کردووە بۆ خۆی وە بــــــۆ پێناسەکەی کە کوردە وە خەلکی کوردستانە.ئازارو خەمی ئەم هونەرمەندە من پێم وایە لەوەدایەکە تەنها بە تابلۆیەک کۆتایی نایەت بەلکو لەچەندین چالاکی و چەندەها تابلۆی جیا جیاداخانەی کارەکانی خستۆتە بەر چاو..هەر جارەی بەرەنگێک و هەر جارەی بە شێوەیەک لە شێوە هونــــەری یەکان.

تاچەند رەنگ و فۆرمەکانی گۆراوون بێگومان هونەرمەند کە لە وولاتی خۆیەوە کۆچ دەکـــــات و دەگاتە سنووری ژیانێکی نوێ رەنگ و فۆرمەکانیشی بەرەو گۆران دەروات و شێوەی نوێ ی لـــــــێ دەکەوێتەوە.

هونەرمەندی کورد جەعفەر کاکەیی چەندین بروانامەو رێز لێ نانیانی نێو دەولەتی وەرگرتـــــوە وەکو کارمن اروزینا وە ماکسیمو لە سالی 1994 وە 1998 لە شاری مەدرید.وە ســــــالی 1994 و1995 و1998 لە مۆزەخانەی جوان میرۆ وە مەکسیمۆ پـــــــــاداشت و بروانامەی وەرگرتووە..

هونەرمەند جەعفەر کاکەیی بــــە راستی من ناتوانم هەموو تاقی کردنەوە سەرکەوتوەکانی لەم لاپەرە هونەری یەدا بخەمە بەر چاوی رۆشنبیران چونکە باس کردن لەو هونەرمەندە پێویستی بــە نوسین و باس و لێکولینەوەی زۆرتر هەیە بەم

شێوەیەش تەنها وەفایەک و ڕێز لێگرتنێکە بـــــۆ ئەو هونەرمەندە کە چەند چالاکی یەکی ئەم دیوو وە یەکلا دەکـــەمەوە، لەو مۆزەخانە گرنگانەی کە کاری ئەم هونەرمەندە کوردەی تیادا نمایش کراوە مۆزەخانەی بینیرو،لاکورونیا لە ئیسپانیـــا وە هونەری هاوچەرخ لە فردرستادی نەرویژی و هونەری نوێ لەواکایامان ی یابان..وە تـــونس و فەرەنساش.. نمایشی کار گەیشتۆتە مۆزەخانەی جوان میرۆ لە مایورکای ئیسپانی..تـــــاقی کردنەوەکانی هونەرمەند قوتابخانەیەکی نوێ ی دروست کردووە لە هونەری هاوچەرخی ئـەمرۆدا.

بۆیە بوونی لە نێو هونەری شێوەکاری جیهانیدا گەورەیی یەکە بۆ هونەرمەندو نەتەوەی کـــورد ناوی جەعفەر کاکەیی سومبلێکی کوردی یە لە هەموو گەلەری و مۆزەخانە جیهانی یەکاندا..

***

## لەئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

## هونەرمەندی شێوەکار ئـــۆمەر ڕەســـوول

ئاشتی گەرمیانی ..هۆلەندا
a.chegani@home.nl

.. باڵندەکانی دەریایی باکوور دەفرن و لە تابلۆکاندا جارێکی تر لەنگەر دەگرنەوە..
...ئەو ڕەنگانەی لە کوردستانەوە گەیشتونەتە ئەم قوتبە، بۆنی کۆچ بەرییان لێ دێت..

دونیایەک هەیە لە ژیانی هونەرمەندا پێ ی دەڵێن وێستگەی بەیەک گەیشتن، ئەو بەیەک گەیشتەی کە جارێک لە کوردستان و جارێکیش لە سەر سنوورەکان ،جارێکی تریش لە غوربەتی وولاتێکی دوور.

هونەرمەندی شێوەکاری کـــــــورد ئۆمەر ڕەسوول... هونەرمەندێکە کە زۆر جار لە شاری سلێمانی وێستگەی دیـــــــدارمان بووەوە جارێکی تریش لە گەلەری یەکاندا

ئەو مرۆڤەی کە هیچ کات بێ بەرنامەو کارو چالاکی هونەری نەبووە.بەردەوام کۆمەڵێک لە تابلۆی جیاجیاو رەنگە زێرینەکانی پێ بووە،
ئەو رەنگانەی کە ئەوەندە گەرم بوون مرۆڤ لە بەردەمیدا چاوو تێر دەبوو.. رەنگ کردنی لە مۆرو پەمەیی و پرتەقالی و زەردو سەوزر و سوور دەهاتە بەر چاویئەو فۆرمانەی کە ستایلی نوێ ی بۆ خۆی دروست کـــــرد لە نێـــــو چوار چێوەیەکی تایبەتیدا.. هونەری شێوەکاری کوردی ئەگەر ستونێکی راستەو راست بێت ئەوا کارەکانی هونەرمەند ئۆمەر رەسوول ستونێکی بالایە لەو رێگا راستەدا.
هونەرمەند ئۆمەر رەسوول سالی 1976 قوتابخانەی ئامادەیی تەواو کردووە، لە شاری سلێمانی لە زۆربەی پێشانگاکانی هونەرمەندانی کوردو هونەرمەندانی شاری سلێمانی بەشداریەکی تایبەتی هەبووە.بــــــە رێبازو شێوازێکی تایبەتی بە کۆمەڵێک تابلۆی لە چوارچێوە گیراو و لە چوار چێوە داخراودا..داخـــــــراوی بابەتــــــەکان وابوون کە رۆژگاری تەل و ئاسن کارتێکراوی ئەو رۆژگارانە بوون.. ستایلی پەت و سێدارە چاوەروانی..
پاشان هەلکشان بەرەو لوتکەی خەم و هونەر،، مرۆڤ و مرۆڤایەتی تا گەیشتنە ئەو رەنگانەی کە بـارانی خەم و خۆشەویستین. ئەو خۆشەویستی بیەیی کە نە تابلۆیەک نە دوو تابلۆ بەلکو قەلایەکی گەورە دروست دەکات.. مرۆڤی هونەرمەند هەردەم لەو رێگایەوە دەست پێ دەکات کە سەرەتایی هەنگاوە..
بەلام پاش تاقی کردنەوەو کۆمەلێک چالاکی هونەری دەگاتە ئەو ئاستەی کە ئیدی قوتـــابخانەی نوێ و رێبازی نوێ و کاری نوێ دێتە کایەوە..چ لە رەنگ و شێوە چ لە رێبازو مۆدیرینی کاری هونــــــــــــەری ،
زۆر جاریش هونەرمەند پەنای بۆ وێنەی دەم و چاو دەبرد بەلام رووبەری گەورەیی هونەر لە بیرکردنـــەوەی هونەرمەندی شێوەکار ئۆمەر رەسولدا.. رووبەری تابلۆکانی گەورەتر دەکردەوە بۆیە ئێستا لەو کەنارەدا کار دەکات کە بالندەکانی دەریای باکوور بال دەگرن و لە تابلۆکانی هونەرمەندا لەنگەر دەگرنەوە.. بەرەنـــگی جیاجیاو بەشێوەی هونــەرێکی جیا.. بۆیە لەهەر تابلۆیەک و تام و چێژێکی تایبــەتی دەبێت.. مرۆڤ چاوی تێروانینی وەکو ئەو میکرۆســـــــکۆبە وایە کە هەرچی بچووک و گەورە هەیە لەژێر میکرۆسکۆبی هونەریدا دەبینیت.. ووردەکاری یان گەورەکـــــاری.. دوو شێوەی جیاواز.. لە نێو تابلۆیەکی پان و پۆردا، بە هەردوو شێوەکەیەوە..مرۆڤ لە کارەهونەری یەکانی ئومـــــــــــەر رەسوولدا تام و چێژی تایبەتی لێ دەبینێ..

زۆر جار دەڵێم دەبێت پاداشتی ئەم هەموو تـــــابلۆ و ئازارو شەونخوونی و بیرۆکەو مەسرەفە چی یە..؟
هونەرمەند شەو رۆژی بۆ دەکاتەوە و سەرقاڵێتی.. دەبێ پاداشتی ئەو تابلۆیانە چی بن؟ کە هەریەک باس لە مێژوویەک دەکات و گێرانەوەی کارەساتێکە.. رۆژانی رەش و سپی.. ئایا تۆ بـــلێ ی هونەرمەند ئۆمەر رەسوولیش لە ئاکامی ئەو تاقی کردنەوەیەدا وەکو من ئەو لێکدانەوەیەی هەبێـــــــت بۆ سارێژ کردنی ئازارەکانی یان ئازارەمرۆڤایەتی یەکانی لە رێگای رەنگ و تابلۆ و کەڤالەوە..
بەردەوامی هونەرمەند ئۆمەر رەسوول لە کاروانی هونەری شێوەکاریدا وەرچەرخانێکی هونەری و مرۆڤایەتی یە.. بۆ دروست کردنی ئەو تابلۆیانەی کە دەربرین لە خەونە بێ کۆتایی یەکان دەکات .

***

## گەشت و گوزار لە ئەورووپاوە بۆ کوردستان

### ئاشتی گەرمیانی..هۆڵەندا

خەونەکانمان دێتە دی بەلام زۆر درەنگ .. فەسادی ئیداری و فەسادی فرۆکەوانی رێگای کوردستان،، وەزارەتی گەشت و گوزار پێ ی زەحمەتە داوا لە کوردەکانی ئەورووپا بکات بۆ یارمەتی دان .. منداڵەکانمان نایەنەوێت بێنەوە کوردستان ... لەبەر بێ جێگایی گەشت و گوزاری.. پتر لە 100000 ئیرۆ لەگەشتو گوزاری ئەورووپاوە دێتە ناو کوردستان لە هاویندا... کەچی یەشتان خەڵک لە بێخاڵ و گەلی عەلی بەگ لەژێر حەسیر دادەنیشن ................ وەزارەتی گەشت و گوزار ئەگەر بە بلۆکیش دیوار بکات تازەگەری یەکی تیادا دەبوو..

ئا لەم تێروانینانەوە سالانێکەئەو پرسیارە لە مێشکی هەموو کەسێکی خەڵکی کوردستاندایە کە ئایا تا کەی وولاتەکەمان بەم هەژاری یە دەمێنێتەوە ؟ تۆ بڵێ ی رۆژێک ناوچەکانی گەلی عەلی بەگ و بێخاڵ و سەرسەنگ و ئەحمەد ئاوا پێش هەموو شتێک ئاوەدان بکرێتەوە.. ئاوەدانی بۆ خۆش گوزەرانی .. ئاوەدانی بۆ دەست کەوتێکی دارای ناوخۆی کوردستان..لاسالانی1999 لا رۆژ ئاوای هۆڵەندا لە4گەڵ چەند دۆستێکی هونەرمەندی هۆڵەندی باسمان لەوە دەکرد کەی سەردانی کوردستان بکەین؟ هونەری ببینین . گەشت گوزاری ببینین؟ کەلتووری بینین؟ زۆر شتی تر.. بەلام بەچی برۆین.. لەوولاتی تورکیاوە زۆر جار ستەمە؟ لە سوریاوە لەو خراپتر. لەئێرانەوە ئەورووپی حەز بەو رێگایە ناکات.

خەونەکان هەڵگیرا بۆ سالانێکی تر .. بەلام حەزەکان لەجێگای خۆیان هەر ماوە پەیوەندی یەکان پتر بوون لەسەر ئاستی ناسینی گەلێک کە کوردستانە.. دوای رووخانی رژێم بەو هات و هەلایەی سەرۆکایەتی کوردستان لە ئاوەدان کردنەوە بۆ شاری نۆێ لە پیرەمەگروون و هەلەبجەو زەراییین...مۆدرێنی لەلای خەلک دروست کرد بەلام بەداخەوە خەونەکان لەرێگای بەغداوە نەهاتنە دی لەبەر بێ وادەیی سەرکردە عەرەبەکان بۆ نەناردنی پارەی ئاوەدان کردنەوەی کوردستان تا ئیستاش هەر قەیرانە. بۆیە خەونی فرۆکەوانی خەونێکی جوانە بەلام بۆ یەکەم جارە گەشتمان بەو گەندەلی یە بینیبێت .. رۆیشتن دەروێت بەلام بەتەمایی گەرانەوە مەبە. لە ئەمستردام سەفەر دەکەیت لە فرانکفۆرت دەگەرێیتەوە .. بێگومان کەسیش لە هەرێم حەدی موحاسەبەی ئەوانەی نی یە منیش تێ نەگەیشتووم بۆچی؟ چونکە تائیستا ئەو هەڵەیە دوبارە دەبێتەوە.

سالی 2005 وە2006 کوردەکانی ئەورووپاش گەرانەوە کوردستان بۆ سەردانی کەس و کاریان وە بۆ گەشتەو گوزاری ناوچەکانی کوردستان وە بۆ شاد بون بە مال و مندالەکانیان وە بۆ ناسینی وولاتەکەیان بە برادەرە ئەورووپی یەکان و مندالەکانیان ئەوانی وا لە ئەورووپا گەورە بوونەو بۆ جاری یەکەمە سەردانی وولاتی دایک دەکەن. بەلام لەبەر بێ جێگای گەشت وگوزارو بێ سەوزایی ولات گەرمایەکی بۆ ژمارە و بێ خزمەت گوزاری هەتا دەستە شۆرو جێگای ئاودەستو دوش کردنی تیادانییە؟ هەروەل لە زاکرۆس تیڤی باسی لێوە کرا ئایا گەلی عەلی بەگ هەر لەژێر ئەو چەترانە خەلک پارەی گەشتو گوزاری پێ وەربگرێت؟

بۆیە منداڵەکانمان ئەمسال 2007 کەپێیان دەڵێیت بابرۆینەوە بۆ کوردستان ......بەهیچ شێوەیەک لەگەل هاتنەوە نین.. ئەمەش کێشەیەکی بۆ ماڵە کوردەکان دروست کردووە.

ئایا وەزارەتی گەشتو گوزار کە هیچیان پێ ناکرێت بۆ نارەزایەک بەبەتێک بلاو کراوەیەک ووروژانێک دەرنابرن.. خۆ براینە ئەوانی ئەورووپا بەدەست بەتال نایەنەوە کوردستان ؟ هیچ نەبێت لە هاوینێکدا پتر لە 100000 یورۆ دەهێننە ناو خاکی کوردستانەوە. بەقەدەر ماندوو بونێک بەریو بەروژەتی ئیقامەمان بۆ بهێننە ئیبراهیم خەلێل ..چونکە ئەوەی دێتەوە کوا کاتی ئەوەی هەیە 2 رۆژ تەرخان بکات بۆ ئەم دایەرەو ئەو دایەرە..گەشتو گوزار ئەگەر باس لەخۆی دەکات تەنها ناوەکەیە ،، پاک و خاوێنی ئەوا بەریوبەرایەتی بەلەدیە دەیکات ..کارەکانی بەلەدیەش زۆر نین بەلام خراپیش نی یە .. من باسی شتێک دەکەم کە خەلک پارەی تیادا سەرف دەکات.. دەبێت وەزارەتی گەشتو گوزاریش ئەوە بزانێت یارمەتی خەلک بدات بۆ دابین کردنی باسی هاتوو چۆو گایاندن و زۆر خزمەت گوزاری تر ..

بەلەدیەو وەزارەتی گەشتو گوزار ئەگەر رۆژانە بلۆکیش لەسەر یەک دابنێن بڕواتان هەبێت شتێک لە سیمای وولاتەکەمان دەگۆرێت بەلام بەرداوام هەر لەناو وەزارەتدا کار بکەن و دەرەوە نەبینن ئەوا کەمن لە ئەورووپاوە دێمەوە بۆ ئەو دەشتە تەنها گوندێک دەبینم .. ئەورووپا هیچی نییە تەنها ئاوی زەلکاو بەنداوە گەشتو گوزاری یەکانی لە دەریاوە هێناوە شتی زۆر جوانی لێ دروست کردوە .. کوردستان ئاوی بەرەلای زۆرە بەلوعەی شکاوی زۆرە ئەگەر تەنها پێشی بگرین بروا بکەن شتێکی هەر لێ دەردەچێت... با کەرتی تایبەت ئەو کارە بکات بەلام نەک تەنها یەک کار بەلکو چەندین کاری ئاوها .. بۆ ئاوەدان کردنەوەی خەلک .. . ..

من سەیرم دێت کە وەزارەت لە بەرنامەکەی زاگرۆس تیڤی دا باسی لەوە دەکرد موتەرجم لە وولاتانی ترەوە بهێنن.. یان موتەرجیمان نی یە .. یائا 5 مانگ دەورە خەلک فێری زمان دەبێت .. کاکە من وا 15 سالا لە ئەورووپام یەشتان ناتق نیم بە 70 لە سەدا یان خەلکی تر 30 سالە لە ئەورووپا دەژیت .. ئەو مامۆستایەم چۆن وێرای ئەوە بلێت کە لە کورستان خەلک بە زمانی ئەلمانی لەماوەی 5 مانگدا قسە بکات؟

باشە بۆچی داوا لە کوردەکانی ئەورووپا ناکەن بۆ هاتنیان لەکوردستان کار بکەن.. بۆچێ بچن لە ئاسیا خەلک بهێنن، ئایا کوردەکانی کیشوەری ئەورووپا کەمترن لەوان ؟

ئايا كورد زيرەک تر نی یه يان دلسۆز تر نی یه لەکەسێکی تربۆ کوردستان؟ ئايا ئەوان داوايان کردوه لە کوردەکانی دەرەوە يارمەتيان بدەن بۆ ئاوەدان کردنەوە؟ منداڵەکەم وا دەلێت .. من بێم لە کوردستان چی بکەم کە هێچ ياريەکی لێ نی یه؟

***

....کاکە رێگامـــــان نادەن....کوردستان ئاوەدان بکەینەوە...

**ئاشتی گەرميانی...هۆلەندا..**

....پتر لە يەک سالە پرۆژەی ئاوەدان کردنەوەی کوردستانمان بە هونەری شێوەکاری خستە بەر چاوی بەرپرسان و هونـەرمەندان بەداخەوە رێگامان نادەن بۆ ئاوەدان کردنەوە....

زۆر لە هونەرمەندان لە پسپۆران لەو کەسانەی کە سەرقالی هونەری شێوەکاری کوردیين سالانێکە پرۆژەی هونەرييان پێش کەش کردوە بۆ ئاوەدان کردنەوەو جوانی کوردســـتان ، بەلام بەداخەوە تا ئێستا هيچ وەلامێک نەدراوەتەوە بۆ ئەو هونەرمەندانە لە لايەن دەسەلاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ، هەر کاتێکيش وەلاميان نەبوو ئەوە بزانە کە قبوول نەکراوە، سەرۆک وەزيران و لێپرسراوانی حکومـەت لە راگەياندنەکاندا هەر دەلێن ئێمە پشـــــــــت گيری دەکەين لەو هونەرمەندانە کە بە هونەرەکەيان خزمەتی هونەری کوردی دەکەن بـەلام لە وەزارەتی رۆشنبيری وا نی یه ..کورد ووتەنی گا لە کوێ کەوتوە وە کونە لەکوێ دراوە....

ڕێکخراوێک بیەوێت بێتە کوردستان و بە هونەر خزمەت بە میللەت بگەیەنێت ..من وەکو مرۆڤێک بە ئاوەدانی دەزانم،بەلام لە لای وەزارەت یان کەسـانی پەیوەند دار گرنیەکی ئەوتۆی نی یە،

لەسالی 1991 لـە ڕەواندوز لە گەل شەهید سامـــــی عەبدول ڕەحمان وە کاک بروسک نوری شاویس وە کاک مەجید ڕزگاری دانشتبوین باس لە هونەرو ئاوەدان کردنەوە دەکرا..کاک سـامی باسی لە کرینی فیشەک و چەکی تازە دەکرد کاک مەجید ووتی کـــــاک سامی توخوا گوناح نی یە ئەو هەموو پارە جوانە دەدەیتە سیلاح بیدەیت بەم هونەرمەنـــــــدانە باشتر نـی یە پەیکەرێکی هونەری پێ دروست دەکەن وە کوردستانی پێ ئـــاوەدان دەبێتەوە..یان کـــارگەیەک بکەینەوە بۆ مریشک دروست کردن،،،،بۆیە بە تێروانیـــــــنی من لە60% ئەنـدامانی سەر کورسی چاویان لە پارەو دەست کەوتە نەک ئاوەدانی...زۆر لاوازە زۆر کەمە ئەو ئـاوەدانی یەی کە ئەمرۆ لـە کوردستاندا روو دەدات لە چاو ئەو ئاوەدان کردنەوەیە.3 پارێزگایە نەک 20، 500 هونەرمەندی کورد مانگانە یارمەتی وەر دەگرن ..ئەگەر هەر هونەرمەندێک یـــــەک تابلۆ یان یەک پەیکەر دروست بکات بێگومان کوردستان ئاوەدانی یان ڕێننسانســــــێک بە خۆیەوە دەبینێت؟؟سالانە چەندین قوتابی لە ئەکادیمیا و پەیمانگا و زانکۆ دەبــــــن بە هونەرمەند بێجگە لە هونەرمەندە خۆرسکی یــــەکان ..100 هونەرمەندی کورد لە ئەوروپا هەن بەم هــــــــەموو توانایەوە ئەگەر خزمایەتی نەمێنێ ئێوەی وەزیران پێتان وا نی یە کوردستان لە گوندێکەوە دەبێتە شار....لە پاش 15 سالی تر دەبێتە دوبەیەکەی خۆتـــان .

بەهەر حال من نالێم ئەوان هیچیان نەکردوە وە کوردستان نەگۆراوە..بەلام دەبێت بۆچونی هونەرمەندان یان بەشداری هونەرمەندان بە چاوێکی ترەوە تەماشا بکرێت .

کاتێک کەسێک لە هونەرمەندان یان مرۆڤێکی بیانی کەتەلۆک یان پێشنیاری یان پرۆژەی پێش کەشی حکومەتی هەرێمی کوردستانی کرد ئەگەر رازی نەبوون لەسەری.. تکامان وایــە وەکو ئسلوبێکی شارستانی سوپاســـــــیان بکەن ...؟؟؟؟؟ چونکە تا مـاون ئەوە جێگەتان نابێت؟؟؟؟

❊❊❊

# کوردستان و نەخۆشی یەکانی بەرەو دەرەوەی کوردستان

**ئاشتی گەرمیانی...هۆلەندا**

زۆر دەترسم ...نەخۆشی یەکانی کوردستان لە بواری هونەرو دروست کردنی هونەر لەرێگای بەرپرسان و کەسانی کە ئەم رێگایەیان دانا بۆ دانانی یارمەتی پارە لە بری کار کردن و دروست کردنی داهێنەری روو لە ژیانی هونەرمەندانی کورد بکەن لە دەرەوەی وولات.

من بۆ ئەم بابەتە روون کردنەوەو دیاردەو تێروانینی تایبەتیم هەیە . یەک لەوانە سەرایی ئەوەی کە لە کوردستان زۆرینەی هونەرمەندان کارو پیشەی تایبەتیان هەیە ، یارمەتی ریز لێ نانیشیان هەیە لە دەزگاکانی هونەرمەندان بەلام بەداخەوە زۆر لە کاسب کاران و بێ پسپۆری و بون بە هونەرمەندی ئەو دەزگایانە نامەو بروانامەی یارمەتی هونەریان وەرگرتووە بە مافی خۆیان یان بە واسیدەوبرادەرایەتی. کەم کەس هەیە لە کوردستان واسیدە بەکار نەهێنێت بۆ وەر گرتنیان لەو دەزگایانە.

دەزگاکان گرنگ نی یە کامە و کێ.. نەخێر گرنگ لە هەردوو لاو لە هەرسێ لا یارمەتی و پارەکە وەربگرن بۆ مەبەستێکی چاو لێک کردن کە هەموو هونەرمەندێک بە واسیدە ئەو کارە ئەنجام دەدات. جا چی بێت یان کام و کێ بێت ئەوە گرنگ نی یە وە کام کار دەکات ئەوەش گرنگ نی یە.

گرو گازندەی هونەرمەندانی ناسراو وە لێ هاتوو لە کوردستاندا زۆرن وە کورت و چرن زۆریان خاوەن مافن وە مرۆڤ بەراستی داکۆکی لەو مافانە دەکات کەلە لایەن دەزگا هونەریەکانەوە پێ شێل کراون وە کەس لێیان ناپرسێتەوە نە بەرۆژ وە نەبەشەو. گرنگ پارەکەیە.. کام پێشانگا وە کام کۆر بۆ کام کۆر گێر. هونەرمەندانێک خاوەن داهێنان و تاقی کردنەوەی سەردەمن لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا بەلام ئەمرۆ لەژێر پەردەی تاریکی کاردا شەوارە کەوتوە لەو گۆرە پانەدا بێ ئەوەی لێزاسنێک لێ ی بپرسێتەوە.

نەخۆشی یەک هەیە دەیەوێت بگاتە دەرەوەی کوردستان ئەویش یارمەتی بۆ ئەو هونەرمەندانەی کە لەدەرەوەی کوردستانن .. زۆر لە هونەرمەندان کە سەردانی

کوردستان دەکەن لەوێ پارەو پارچە زەوی  و شتی تریشیان لەلایەن لێپرسراوەکانەوە بە ئیکرامیەو بێ ئیکرامیە پێ دەدەن. بۆ کاری هونەری یان بۆ برادەرایەتی یان بۆ هەوەسی حیزبایەتی ...ئەمە وای کردووە کە هونەرمەندەکانی تریش ئەو رێگایە بگرن و قوول ببنەوە لە ناویدا . بە زووترین کات روو بکەنە کوردستان وەکو ڤایرۆس ئەو نەخۆشی یە بگوازنەوە بۆ ئەوروپا.

***

## پەیامێک بۆ هونەرمەند کەمال مەحەمەدی گۆرانی بێژ............ئاشتی گەرمیانی

بە تازە ئاوازەکانت لەم قوتبە ووشکمانت کردەوە.......ماچێک پرە لە تینووی ئاواز.. پرە لەو غوربەتەی کە من و تۆی کردووە بە هاوەڵ و هاورێ ی ئەم قوتبە.. تۆ هونەرێکت هەیە پرە لە سۆزو گۆرانی و ناز.. نەرمی و خاو بوونەوە بۆ ناو زاخاوەکانی عەشق... منیش تەواوکەری ئەو ئاوازانە دەکێشم کە تۆ لە قورگی ئاوازتەوە دەربرینی لێوە دەکەیت، من بەو تابلۆیانەی کە من و تۆی تیادا جێگە نیشین دەبێت..هاورێ ی یەک رێگایین...ئاوازەکەی لەرەی دەنگت وام لێ دەکات رەنگەکانم سارتر بن لە کلۆی بەفر.. سارتر لەو ئاسمانەی کە لەقوتبی بەستەلەکداسارتر خۆی دەبینێتەوە..کەمال مەحەمەد.. مامەلە لەگەڵ ئەو ئاوازە دەکات کە مرۆڤێکی ئاشق وون بوە لە ناو سۆزو ئەشقی ئەم گۆی زەوی یەدا وە بۆ لەشی خۆی دەگەرێت ...خەونێک وا لە سلێمانی یە ...ئەوی تر وا لە باوەشی ئەم غوربەتەیە کە هەموومانی تیادا کۆ کردۆتەوە...1981 لە سلێمانی بە دەنگی ئەو زۆر کەس ئاشقی جوانی کوردستان و کەسایەتی بوون..ئەمرۆش پاش 27 سال هەمان رەتمی گۆرانی و لارانەوەی دەنگ بۆ گوێ ی ئەو مرۆڤانەی کە شەیدای ئەو مرۆڤە بوون...... کەمال مەحەمەدی هونەرو گۆرانی بەراستی داهێنەرێکی شەرمنۆکانەیە هەر لە و دونیایە زۆر ئاوازو گۆرانی جوانی لێ کەوتۆتەوە... کەم کەس هەیە لەو ووشانە وورد بونەتەوە کە دونیایەک مان دەبەخشن بۆ جوانی مرۆڤ و جوانی ژیان. هونەرمەند کامال مەحەمەد ئەستێرەیەکی مرۆڤایەتی یە بۆ ئەمرۆی ئەو مرۆڤانەی کە لە یەک ئازاردا کۆ دەبنەوە..... کەم جار

هەیە تابلۆیەک دەکێشین بە ئاوازەکەی کەمال مەحەمەد چری پر نەبێت وە هێلەکان و ڕەنگەکان و ئاوا بوونی هەتاو .. بۆنی ئاوازی ئەم هونەرمەندەی لێ نەیەت... من و تابلۆ و ئیوارانەکانی کەمال مەحەمەد یان ئەستێرەو خەون و کۆتایی و غوربەت لا ملی ڕەنگاو ڕەنگی نیشتیمان.... تابلۆیەک لە ئازارەکان تابلۆیەکیش بۆ پەیامەکەی کەمال مەحەمەد.

❊❊❊

## ڕۆژی شازادەی هۆڵەندا.. تەنها بۆ هۆڵەندی یەکان نی یە....

**ئاشتی گەرمیانی ،،، هۆڵەندا**

... ڕۆژی لەدایک بوونی شازادەی هۆلەندا ویل هیل مینا ڕۆژێکی کەلتووری یە بۆ هەمووان .. کوردیش وەکو هەموو ئەو نەتەوانەی کە لە هۆلەندا نیشتە جێ بوون بەشدارن لەو ڕۆژەدا...
.. چەندین چالاکی هونەری نمایشی هونەری لەسەر ئاستی ئەم وولاتە پێش کەش دەکرێت بە مۆرکی کوردەواری ... زۆر هونەرو کەلتووری جیا جیای وولاتانی دونیا لەم ڕۆژەدا دەبینرێت .. لەم ڕۆژەدا نزیک بونەوەی هەموو کەلتوورە نێو دەولەتی یەکان هەیە.. بۆ ڕۆژی شازادە خەلک لەشەقامەکان شت و مەکی بەکار هێنراو دەفرۆشن و دەگۆڕنەوە...مندالان گوڵی خۆشەویستی پێش کەشی گەورەکانیان دەکەن ... ئالآی هۆڵەندا هەموو بەر مالێکی گرتۆتەوە..

بەم تێروانیانەوە مرۆڤ کاتێک لە وولاتی ژێر ئاستی ئاودا دەژیت واتە نیدەرلاند.. بێجگە لە جوانی سروشت و ئاو هەواو جوانی وولات و مرۆڤ .. هەندێک جوانی تریش هەیە وەکو ڕێز گرتن لە شازادەی وولاتەکەی .. یادی لە دایک بوونی شازادەی گەورە ویل هیل مینا کە هەموو سالێک ڕێکەوتی 30.4 دەکات .. کە ڕۆژێکی پشوو دانە لە سەرانسەری ئەم وولاتە لەو ڕۆژەدا خەلکی هۆڵەندا لە باکورو باشورەوە بە هەموو هەرێمەکانەوە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئاهەنگ گێرانی ڕۆژی شازادە یان خەلکی

ئاسایی دەلێت رۆژی مەلیکە بۆ ئێمە رۆژێکی کەلتووری یە ، بۆیە هەر لە 29.4 وە خەلک لە نادی و گۆرەپانەکاندا ئاهەنگ و کۆنسێرت دەگێرن تا شەویکی درەنگ . سبەینێش هەر لە کات ژمێر نۆی بەیانی یەوە لە بازارو جێگا تایبەتی یەکاندا شتو مەکی بەکار هێنراو دەدەنێن بۆ فرۆشتن بە پارەیەکی زۆر کەم .. پێش کەش کردنی مۆسیقاو تەپڵ ولەبەر کردنی جل هو بەرگی تایبەتی و گۆرینەوەی شت و مەک لەگەل کەسانی تر وە ریکلام کردن لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانەوە ، رازاندنەوەی ئۆتۆمۆبێل و مرۆڤ و خانوو بەرەکان ، سیمای ئەو وولاتەیە کە خەلک خۆی حەز لەو دەسەلات و ژیانە دەکات .. زۆر کەسیش کاری کاتۆری شازادە دەکات یان ئەو رۆژەی بەدل نی یە ئەوەش بەدیموکراتی بوونی ئەو ژیانەیە.

ئێمەی کورد چین لەم ناوەندە .. زۆر رۆژێکی خۆشە بۆ کوردە نێشتە جێ بووەکان لە وولاتی هۆلەندا چونکە لەم رۆژەدا کوردیش کەلتووری خۆی پێش کەش دەکات وە زۆر کاری هونەری دەگۆرێتەوە لەگەل کەلتوورەکانی دونیادا ، بۆیە ئەگەر مرۆڤ سەردانی ئەو ناوەندانە بکات لایەنی کوردی زۆر بە ئاشکرایی دەبیینێت بە پێش کەش کردنی بلاوکراوەکانی کوردو ئالاو زۆر جار جلی کوردی و پەرتووک.

مندالانی کوردیش وەکو تێکەڵ بونێک لەگەڵ کەلتوورەکانی تری دونیا وە تێکەڵ بوون بە ژیانی هۆڵەندا بەشداری ئەم رۆژە دەکەن.بەکاری هونەری وێنە کێشان و لەبەر کردنی جلی کوردی .. ناساندنی کەلتووری کوردی بە کۆمەلگای هۆلەندی کارێکی راستەو خۆی نیشتەجێ بووەکانی کوردی ئەم وولاتەیە بۆیە لەو رۆژەدا زۆر تێکەل بوونی تایبەتی دروست دەبێت لەگەل جەلکی کوردو خەڵکی جیا جیای دونیا .

ئالا جوانترین هێمایە بۆ رازاندنەوەی ولات و مانیەکە بۆ سەروەری ئەو وولاتە یادە پیرۆزەکانی ئەم ووکلاتەش بە ئالاوە دەرازێنرێتەوە . زۆربەی مالان بێ ئەوەی ئاگادار بکرێتەوە خۆی بەسەربەستی ئالا هەڵ دەواسن.

مندالانی ئەم ولاتەش گوڵ دەکەنە دیاری بۆ رۆژی شازادە لە 30 مایی هەموو سالێکدا.

***

## ڕۆژگارێک لە ئاســـــن و تەلی درکـــاوی...........

ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا..2005

وولاتی ئاسن وتەلی درکاوی.. ئاسن و باروت و تفەنگ و بۆمبا .. لە جەنگێکەوە بۆ جەنگێکی تر.. ڕۆژانە لەگەل ئاسمانی ساف و بێ گەرد و هەتاو..هەر دوکەلی رەشەو ئاسمانی شارەکەمـــــی گرتووە .. دەنگی بۆمباو باروت.. جەنگی جیهانی یەکەمیش هەر ئاوها بووە.. زۆر کەس هات و ڕۆیشت زۆر کەس هیوای بە ژیان هەبوو.. زۆر کەس بە هیوای ژوانێکی تر نەگەرایەوە.. زۆر لاوی جوان جوان .. گولە نیسانەکانیان بە باروتی زەمەن هەلوەریو جارێکی تر چرۆیان نەکردەوە......

زۆر بالندەو ئاژەل لەگەل یەکەم زەنگی کلێسەو یەکەم تۆپە هاوەنی ڕۆژانە هەموو بالندەکــــان لەسەر تێلی عامووەدەکان هەلفرین، جارێکی تر ئەم دەموو چاوانەم نەبینیەوە .. لەگەراجی بەغـدا لە بەغدا هەزارەها دەم و چاوی جیا جیام بینی لە یەک چرکەدا ، هەموو یەک جل و بەرگ وە یەک کلێتەو یەک چاکەتی بۆر هەر هەموو بەرەو لولەی تۆپ و خۆ هەلواسین لە بەردەم ڕۆژ.. هەندێکـــی تر لە نێوان دیوارەکاندا بەند کراون، بۆیان نی یە بۆنی مێخەک و هەتاو بکەن ..هەتا مردن.....

لە لیستی تاوانباریدا دژی گوللە و باروت و تۆپن .

پردی پەرینەوەی بەغدا ڕۆژانە چەندەها مرۆڤی پێدا دەپەرێتەوە شەرت نی یە ئەو مرۆڤانــــــە پاک و خاوێن بن،، هەندێکیان جاسوسن هەندێکی تریش تاوانباری مرۆڤایەتین.هەندێکر تریـــش خۆشەویستی پردی پەرینەوەن،، چونکە مالی خۆشەویستەکانیان لەوپەری پردەکەوەیە،، ئاســـن و تەلی درکاوی.. مندالی بێ دایک و باوک لە شەقام گەورە بوون و زۆر جار جوتیارن وە زۆر جاریـــش پیاو کوژن و پیاو کوژیان لێ دەرچووە، زۆر جاریش تا دەمرن بێ نازو بێ لانەن ..تەنها یەک نامە و هەوال تەمەنی چاوەڕوانی دەریای ووشکم سەر لە نوێ تەردەکاتەوەوبۆ بەردەوامی ژیان..............

بیست سالی چاوەڕوانی بۆ یەک جاریش هیچ دەنگێک نەبوو.. ئاسن نەما تاقی نەکەینەوە کام میتال باشترە لە کامە، لە ئینگلیز دروست کرابێت یان لە ئەلەمان یان لە ئیتالیا کامەیان زوو تر ژەنــگ هەل دەهێنێ کامەیان جەرگ برترە.. هەزارەها دەم و چاوی جیاجیا.. دەست و قاچ و سنــــــگ و پەراسوو..هەموو ئەو پارچانەمان

دەوێت بۆ دروست کردنی هەزارەها مرۆڤی تری ئاسنین بۆ ئـــــەم سەردەمە.. ئێمە لە خۆرهەلات باشترین کارگەی مرۆڤ و لە ناوبردنمان هەیەپێویستمان بە هەمـــوو ئەو کەسانە دەبێت بۆ رۆژگارێکی تر و ناوی لێ دەنێیین شەری کیشوەری و تەقاندنـــــەوەی زەوی و دابەش کردنی بۆ دوو دەولەت.. ئەم بەرو ئەوبەری زەوی لە بۆشای ئاسماندا پێویستیمان بە ڤیـــزا دەبێت بۆ ئەوەی بچینە ئەوبەرەوە و سەردانی کەس و کارمان بکەین چونکە لەوە دەچێت هەردەم ژیان و کار پێویستیان بە یەکتر هەبێت..

هەندێ کەسی تر پتر لە پێنج هەزار مرۆڤی بێ جل و بەرگ و بێ پێلاو زۆریان بێ سەرو دەست پەریون لە بیابانێکی ووشک گەراونەتەوە و دەم و چاویان رەش و خەلوز دەلێن ئێمە پاشماوەی ام المعارکین....

هەندێکی تر وا لەسەر چیایی گردەمەنن و گولیان دەرکردووە وونن تا ئێستاش دەگەرێن بە دوای کەس و کاریانداو هەر لەو دۆلەن و رێگایەک نی یە بیانگەیەنێتە سەر شەقامی قیر. لە بۆنی بارووت کــــاس بوونەو کەس گویی ی لە کەس نی یە .. زۆریان ناوی خۆیان لەبیر چۆتەوە و نازانن لە کوی وە هاتوون هەر دەرۆن و بە سەر لاشەی مردوەکاندا هەنگاو دەنێن.هەندێکی ترم بینی لە شام زەمانە تەمەنێکـــــە بە کۆچ بەرێتی هاتوەتە شام و منداله چاو شینەکەی و دایکیان لە سێ دارە داوە لە شارە عروبـــەکەی موعتەسەم باللە.. هەندێکی تر بە شایەتی و بە مۆقەت تەلاق دراون تەنها بەمۆقەت و سەرو قـــــــژ سپی و دەم و چاو چرچ و لۆچ بە دوای مەلاکەدا دەگەرێیین تەلاقی موەقەتی زەمەنی ئاسن چـــــــــالاک بکەینەوە.. هەندێکی ترم بینی لە سەر شەقامی زاخۆ دەسکە نیرگزە جاریان پێ بوو ودەیان فرۆشـــــــت نە دەستەیەک و نە دوو دەستە هەر لە موسلەوە تا زاخۆ هەر مندال و گول بە دەستە چاوەروانن تەنهـــــا یەک دەسک بفرۆشن..بەلام کێ دەیان کرێت گولەکانیش هەتیەن بێ باوک و دایک ..کێ هەیە پارە بـدات بە گول بە هەتیو...

نامەکانم مەکەنەوە ،هەرچی نامەیە لە چیاوە هاتوە بۆ خۆشەویستەکان هەر هەمووی لە یەک ژووردایەو هیچیان نەکراوەتەوە تەنها مۆری هاتنە ژوورەوەی لێ دراوە، نابێت بگاتە دەستی خاوەنەکانیان .......

لە هەولێر.. کابرایەک ناوم بیست ووتبوو من کچەکانم بە کرێ دەدەم..بۆ ئەوەی دوو کورسی پێ بکـــرم مندالەکانم بەکرێ کار دەکەن دەمەوێ خانووەکەم تازە بکەمەوە ..لە

کەرکووک من دەچم هەوال بـــــــۆ ئەمن و ئیستخبارات دەبەم کە ئەمشەو پێشمەرگەیەک لەو ماڵە نوستبوو با خاوەن ماڵەکە هەل بواسن....

لە سلێمانی ،، من بە رۆژ ئیمزای دەکەم و ملی زۆر کەس دەشکێنم و بە شەویش هەر خۆم تەقە لە خـــۆم دەکەم،، لە دهۆکیش ئەمشەو دەچین بۆ بۆتان ملی خەج لە بندا بە چەقۆ دەبرین و سبەیی بە پۆستـــــی ئیکس پریس دەینێرینە بەغدای ئازیزمان... لە بەسرەش کێ بڵێ بە پیاوە دڵسۆزەکان تۆ راکردووی..بـێ یەک و دوو وەکو مریشک پەلەکانی لێ دەکەنەوە . بێ دایک و باوک گەورە بوون لە شەقام تەنها یەک نانی رەق و گولێکی سپی.. پایزەکانیش..سەردانـــــی قەبرسانەکان دەکەین گۆرەکانی هەل دەدەینەوە من تەنها یەک گول و نامەم وونکردووە .. یەک یـــــەک لا قەبرەکان هەل دەدەمەوە هەندێ جار خەنجەری خیانەت دەدۆزمەوە هەندێ جاریش مرۆڤی بێ گونـــــا بە بێ تاوان کوژراوە بە هەلە .. زۆر جاریش دەم و چاوەکان دەناسمەوە کە لە قوتابخانەی سەرەتـــــای بووین ئەم دەم و چاوە لەگەلمدا بووە ئەمەی تریانپۆلیس و شورتە بوون کە داوای ناسنامەیان لێ کردیــن ئەمەی تریان هاوسێ کەمانە و ئەوی تریشیان ئەو کچە بوو کە سەریان بری ،چونکە حەزی لە لاوێـــــک بوو لە تەمەنی خۆیدا.

ژمارە نەما لە بەری نەکەم هەر لە سالی 1919 وە تا ئەمرۆ 2005 هەرچی کێلە قەبرەکان هەیە شیین کراوە بۆ ئەوەی کەس نامەکانیان نەخوێنێتەوە بە ئاشکرا کەسیش تەماشای ئازەرەکانیان نەکات.......

ئەم بیرەوەریانە هیچ کات لەبیر ناکرێن و کال نابنەوە ئەو کاتە کال دەبنەوە کاتێک مرۆڤ کۆتایـــــی بێت . بەلام بێگومان بە دوای ئێمەش هەر باس دەکرێت ئاسن و تەلی درکاوی و بیرەوەری تـــــــال...

❊❊❊

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

...گەندەڵی ئیمزا و مۆری بەڕیوبەرایەتی یەکان....لە بەغداوە گەیشتە هەرێمی کوردستان..

ئاو نی یە..غاز نی یە، نەوت نی یە، بەنزینیش نی یە،
کوردستان..لە لیکسمبۆرگ و ڤاتیکان و سلۆڤینیا دەولەمەند ترە...بەڵام ئێمە دزمان زۆرە.....کە مرۆڤ گوزەر دەکات بە وولاتانی وەکو لکسمبۆرگ وپێیدا تێ دەپەڕێت بە نیو کات ژمیر کۆتایی بە وولاتاکە دەهێنێت ..تەنها بەدارو سەوزایی جوانی خۆی خەملاندوە بە کانیاو ئاو بە دروست کردنی ڕیگاو بانێکی ئاسنیین نەک بەدووڕۆژ هەل بتەکێت،بەنداوی ئاو تا ئێستا لەووڵاتاکەی من نازانن بەنداو چی یە،ئێمە ئاوی دەریایەکمان هەیە زۆر بە بێ نازو حورمەت گرتن سەرەوخوار دەبێتەوە،ئەو بەفراوەوەی کەلەچیاکانی کوردستانەوە دێنە خوار ..کەس لە ئێمە تەماشای ناکات بۆ جوانی و پاکی..لە لکسەمبۆرگ..ئاو پەنگی خواردۆتەوە تا هەموو کەس چاوی لێ بگرن جوانی یەکانی بنەخشێنن..وولاتێک بەبێ هیچ کانزایەک بۆتە جوانی سروشت و وولاتی پیشەسازی..وولاتی شارستانی و گەشت و گوزار..کوردستانەکەم .. وولاتی گەشت و گوزارە بەلام دزەکان بەرپرسە سەقەتەکان ئەوەی ناوی شارستانی بێت نایانەوێت لە ئەرشیفی کوردستاندا بێت،ڤاتیکان بچووکترەلە لیکسمبۆرگ کەچی تەنها بەهونەر ڕازاوەتەوە هەرچی تەماشا کەرانی دونیا هەیە دێن بۆ تەماشای پەیکەرە نەمرەکانی سەدەکانی ڕابردوو ،، هاوچەرخێتی لە ڤاتیکان لە هونەردایە هونەری پەیکەر سازی،وولاتی منیش پاش بوونی 5 پەیمانگای هونەری 5 کاری هونەری داتاشینی تیادا بەدی ناکەیت ... وولاتێک پڕە لە ئازارو مەینەتی کام پیاو خۆی بەقارەمان دەزانێت بێ لاقە بەرانبەر بە پارەکانی بریمەر .. کور ئەو کورەیە لە وولاتی من خاوەن 8 ڕاتب بێت،نەک خاوەن داهێنان و بەهرە ..وولاتێکی وێران...ئەگەر ڕێگا نازانیت بۆ دروستی دەکەن..ئەگەر نازانن جوانی بکەن بۆ کاولی دەکەن..وولاتێک زۆر سەرقاله بەڵام بێ ئەندازەیە...لادێیەکی قەلەبالغ،واز لە جوانی با بهێنین گەندەڵی ئیداری وای کردووە تەنها مانەوەیەک تەنها ئیمزایەک 5 تا 6 ژووری دەوێت..پەرەیەک پڕە لە

مولاحەزات و راو بۆچوون ..تەنها بۆ مانەوەیەک... من خۆم کوردستانیم خاوەن بەلگە نامەم کەچی دەبێت لە وولاتی خۆت داوای مۆڵەتی مانەوە بکەیت .. زۆر ستەمە بۆ ئەوانەی کەلە دەرەوە سەردانی وولات دەکەن..مرۆڤ وورد وورد دەکەنەوە..تۆ دەکەویتە ناو کرێکارو شۆفێرەکانی ترێلەوە بۆ پاڵە پەستۆی مانەوە..یەک رۆژ لە چاوەروانی ریز گرتن بۆ یەوەی تام لە کوردستان بگریت...من نازانم ئەوەی ئەم بریارەی دەر کردووە چ بلیمەتێکە لە کوردستان کە دەیەوێت حورمەتی بالای کوردستان بپارێزێت .. بە دروست کردنی سیمای جوانی کوردستان..وولاتێک شوان بەرێوەی بەرێت توخوا دەبێت چۆن بێت...من دەزانم ئەو کوردستانە تا دوا هەنگاو واناچێتە سەر بە نەبوونی غازو نەوت و بانزین ....بەلام کەسانێک هەن سوود بەخشن لە گرانی ژیان و کەرەستە ئیدی با کوری کابراش بێت ،،دوبەی وولات یان وولاتی دوبەیی ئاوها بە ئاسانی دروست نەبووەکە سەرۆکایەتی کورد خەونی پێوە دەبینێت..پرە لە پلان و دارایی و ئەندازە..کەچی لە کوردستان دەیانەوێت بەبێ پلان شارێک بکەن بەگوند....شەقامەکان هەروا بێ نا زانستی دروست کراون تەنها گەورە کراونەتەوە..کوردستانێکی وێران لەسەردەمی ئابووریەک و داهاتێکی گەورەدا...تادێت دزەکان گەورە ترو قەلەو تر دەبن.... ئەوە کوردستانی شارستانی یە... خەبات کردن بۆ هونەر یان بۆ کورسی و پارە..........لە کوردستاندا

## ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا

تا دەگەنە پلەیەکی بەرز لەکار هەزار کون و کەلەبەر دەکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان....دەبێیت لەهەموو دەزگایەک کەسێک بناسیت ئەگینا مالت وێرانە...هونەر بۆ مرۆڤایەتی یە نەک بۆ گەندەلی ئیداری کوردستان.

دیاردەیەکی زۆر ئاشکراو روون بەر چاوی خەلک و کەسانێک دەگرن کاتێک سەردانی هەرێمی کوردستان بکەیت.. گەندەلی ئیداری و مرۆڤایەتی خەبات کردن بەرەو دواوە واتە هەلبژاردنی ناهاوچەرخێتی مرۆڤ لەژیانی رۆژانەی ئەو میللەتەی کەخەباتی کردووە بۆ وەدەست هێنانی ئامانجەکانی گەل و پێشمەرگە ... دیاردەی خەبات کردن بۆ

کورسی و هەوڵ دانی دزی لە ئیدارەکانی هەرێم دیارەیەکی روون و ئاشکرایە .. دەمی کێ دەکەیتەوە هەمان خەمە نە بەمن وە نە بەتۆ چاک نابێتەوە ئەو گەندەلی یە ی کە لە سەرکردایەتی یەوە چاوی لێ پۆشێنراوە .
لە هەموو دونیادا هونەر بۆ مرۆڤایەتی یە ..هونەر بۆ بزنز بوە.. هونەری بازرگانی ..بەلام بەداخەوە تا ئێستا لە وولاتەکەی مندا سستەمی هونەری مرۆڤایەتی بەدی ناکەیت .. ئەوە نەبێت کەلە رێگای هونەرەوە بگەیت بە پلەی بەرزو کۆ کردنەوەی پارە و ژیان.. من نالێم ژیان پێویستی بە پارە نی یە .. بەلام ئەگەر سەردانی شارەکانی کوردستان بکەیت ئەو سیمایە بەرچاوت دەکەوێت.
بۆ یەکەم جار لەشاری دهۆک پێشانگای یەکەمی هونەرمەندانی کورد کرایەوە .. بە بەشداری زۆر لە هونەرمەندانی کورد لە ناو هەرێم و دەرەوەی هەرێم بەلام دەکرا هەولی ئەو هونەرمەندانە گەورەتر بکرایەتەوە بۆ پێشانگایەکی ئەنتەر ناشنالی وە لە ئاستێکی بەرزتر چونکە ئەمرۆ مرۆڤ لەناو چوارچێوەی دەولەتدا کار دەکات .. ئەوە خزمەتی هونەرو مرۆڤایەتی یە... سیمای ناشارستانی ئیداری زۆر لە ئیدارە کوردی یەکانی گرتۆتەوە بە دووبارە بونەوەی ئیمزاو مۆرو هیلاک کردنی مرۆڤی کورد...من دەلێم ئەگەر ئەم شێوە گەندەلی یە بەکار نەهێنن بروا ناکەم کارمەندەکان جێگایان ببێتەوە لە هەرێمدا، بۆ مانەوە لەسەر کورسی و پاراستنی مافەکانیان پەنا بۆ دۆستایەتی و هاوکاری دەبەن .. مرۆڤی نەنەسراو لە هەموو کەس زیاترە ،، کێ بەکێ یە ،، لە سەدا 70 خەلک لەکوردستاندا بەرپرسیارە ..ئایا ئەم بەر پرسیارێتی یە تا کوێ دەروات .. وە بەکوێ دەگات ..کورسی هونەر پیرۆزە پیرۆز تر لەوە خاوەن هیچ داهێنەریەک نی یە تەنها کوری فلان دەناسێت.... ئەگەر هەر بەریوبەرێک بزانێت لەسالێکدا چی کردووە یان چی بووە دەست کەوتی خزمەت کردنی بێگومان بە ئێستا وولاتێکی رازاوەدێتە کایەوە..ئەگەر هەموو لێپرسراوێک پرسینەوەی ئیداری لە بەرپرسەکان بکردایە ... هەر مەکتەبێک 3 تا 4 سۆزانی تیادا نەدەگیرا..بەداخەوە بۆ خەباتی دزی .. گەندەلی ئیداری و سۆزانی ئەمرۆ بەدزی سبەی بەئاشکرا لە کوردستاندا بانگەواز دەکرێت.
خەبات کردن بۆ پلەو پایە لەکوردستاندا کاری سەرەکی ئەو مرۆڤانەن کە رۆژگاریان کردووە بەو سومبلە وە رێگا خۆش کەر هەیوە بۆ یەو کارە.. هەرێمێک بەرەو گرانی بروات وە جێگای مرۆڤی هەژاری تیادا نەبێتەوە خەبات کردن بۆ دزی و پلەو پایە ... بەهیچ کیشێک چارەسەر ناکرێت.

***

## بێ واسیدە نابین بە هونەرمەند لە کوردستاندا....

**ئاشتی گەرمیانی**

..تائیستا کەس لە پیاوانی حکوومەتی هەرێم نەیان وێراوە کە بلێن ئەوەی گەندەلی بکات لە کار دەری دەکەین یان لێیان دەبرسینەوە..بەلکو بە پێچەوانەوە تادوێنێ لە پەیوەندیەکی تەلەفۆنیدا لەگەل هونەرمەند ف.خ دا باسی ئەوەی کرد کە من تائێستا وەرنەگیراوم بۆ رێز لێ نانی هونەرمەندان..بەلام بەرێز وەزیری یەدەک پەیوەندیم پێوە کردوە ووتی کاک ف.خ من واسیدەیەکت بۆ دەکەم تا وەربگیرییت.

ئا لەم خالانەوە من تەماشای ئایندەی کوردستان دەکەم کە دەبێت ئاکامی هونەرمەندی داهێنەرو نا داهێنەر چۆن جیا بکرێتەوە..دەبێت کێ رێزی لێ بیگیرێت وە کێش نابێت رێزی لێ بیگیرێت چونکە کارامە نی یە..ئایا شتێک هەیە ناوی یاسا بێت و لەسەر هەمووان جێ بەجێ بکرێت بە بێ روتووش. یان هەر دەبێت لەوەوە دەست پێ بکەین کە بۆ هەموو کارێک تەلەفونێک بکەین یان نامەیەک بنوسین بۆ کاک فلان؟؟ئەگەر نامەیەک پەنجا ئیمزایی بوێت..کارێکی ئیداری واسیدەو پالە پەستۆی بوێت،کاسب کارێک هونەرمەند بێت،ئاسنگەرێک رێز لێ نانی هەبێت. بۆچی نا لە 70% کوردستان مووچە خۆر بێت و دەوام ئەکەن و ناکەن؟
مادام گەورە دەیخوات..من بۆ نا؟ ئەوەی من بزانم زۆر هونەرمەند هەیە زۆر خەبات گێر هەیە تا ئێستا لە کوردستاندا بێ بەشن بۆ هەموو یارمەتی و رێز لێ نانێک..وە ئەو مرۆڤانە زۆریان پێ گرانە کە بچن بۆ لای ئەو کەسەی کە ئاگای لە هونەر نی یە داوای مافی خۆیان بکەن ؟ ئەمانە ئەو نیگەرانی یەیە کە نەک تەنها من بەلکو چەندەها رۆشنبیر لە دەرەوەی وولاتدا پرۆتۆستۆی ئەو گەندەلیانە دەکەن کە تاوەکوحکومەتی هەرێمی کوردستان نەی توانیوە چارەسەری بکەن..یان تەنها رێگا چارەیەکی بۆ دابین بکەن..بە داخەوە تا دێت بەرەو خراپترین شێوە دەروات..کە گەورە کردی من بۆ نەیکەم..ئەمە فەلسەفەی ئەمرۆی ئەو هەرێمەیە..هەموویان سەردانی ئەورووپا دەکەن دەبینن دەبیستن کە چۆن کاری 100 کەس کۆ کراوەتەوە بۆ 20 کەس..لە هەموو

ئەوروپا بۆ ئیمزا باوی پالەپستۆ نەماوە..ئێمە لە کوردستان لێپرسراوەکانمان کە ئەوروپایان بینیوە لە هەر بەرێوبەرایەتیەک 8 کارمەندی زیاد هەیە کەچی هەر پالە پەستۆیە و کارەکەش ئیمزاکەش ئەمرۆ تەواو نابێت؟؟؟؟؟؟
بۆیە کاک ف.خ ناحەقی تۆش ناگرم برۆ واسیدەکەت بکە لەلای کاک.....وەزیری یەدەک..جونکە هەرچۆنێک بێت تۆ رۆژێک لە رۆژان لە ژێر سەرمایەکی ساردا کاری ە چاوێک لەهونەری شێوەکاری کوردی لە ئەوروپا

## ئاشتی گەرمیانی.. هۆلەندا

زۆر لە هونەرمەندانی کورد لە ئەوروپا وازیان لە هونەر هێناوە..
هونەرمەندانی کورد ..بۆ نازناوی کار ناکەن ئەوەندە نەبێت بۆخزمەت بە کەلتووری کوردی لە دەرەوەی وولات ولە ناو کۆمەلانی خەلکی ئەوروپیدا.

کەم کەس هەیە لە ئەوروپادا نەزانێت کە هونەرو کەلتوورێکی تر بێجگە لەئەوروپی ژیاوە وە دەژیت لەگەل ژیانی رۆژانەی ئەو خەلکەی کە تێکەل بوونە بەو کەلتوورە . چ لە بیانی یەکان وە چ لە پەناهەندەکان چ لە کۆچ کردووەکان..هونەری کەلتوورێک کە لە وولاتانی دەرەوەی ئەورووپاوە هاتونەتە ناو ئەوروپا زۆر شتی لەژیانی رۆژانەی ئەو خەلکەی گۆریوە .. بۆیە بوونی هونەری میللەتانی دەرەوەی وولات شتێکی نامۆو جوانە بۆ چاوی ئەوروپی یەکان.. بە ناوی کوردیش زۆر لە هونەرمەندان لە وولاتانی ئەوروپا کوردستانیان ناساندوە بە خەلکی ئەوروپا بە حکومەتەکان بێجگە لە کارە هونەرەکانیان .. کارە هونەرەکانیان هەردەم جێگای سەرەنج و تێروانین بووە.. راستە تاوەکو ئێستا هیچ کۆمەلەیەک لە ئەوروپا وەکو دەزگایەکی حکومی رەسمی نی یە بەلام بەکاریهونەرمەندانی کورد بە شەو نخونییان زۆر کاری گەورە بەئەنجام گەیەنراوە..هەر لە کردنەوەی پێشانگاتاییەتی یەکان یان هاوبەشی یەکان و بەشداری کردن لە فیستڤال و کۆرو رۆژە کەلتووری تیەکان لە ناو ئەوروپادا.. ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ئەوروپا کیشوەرێکە نەک چەند وولاتێک .. بۆیە زۆر هەول و رۆلی گەورەتر دەخوازێت بۆ ناساندنی ئەو کەلتوورە بەهەموو ئەوروپا.. زۆر رێگای جۆراو

جۆر هەیە بۆ ناساندنی کەلتووری کوردی بە ئەورووپاو کیشوەرەکانی تری دونیا.. لەهەر جێگایەک کورد هەبێت بێگومان کەلتووری کوردیش دەناسرێت بەگەلانی دونیا ، بۆ ئەم کارەش زیاتر هونەرمەندە شێوەکارەکان ئەو رۆڵەیان بینیوە لە زۆرینەی کۆرو کۆبونەوەو فیستیڤاڵدا ، زۆر لەو کارانە بە داوەت کردن و بانگەنیشین دەکرێت زۆریش بە پێش کەش کردنی بەرنامەکان دەکرێت .. زۆر جاریش بە هونەری مۆسیقا ئە و نازناوەتی یە پێش کەش دەکرێت .. هونەر لە دەرەوی وولات زۆر بە زەحمەتی ژیان پێش کەش دەکرێت لە کرین و پەیدا کردنی کەرەستەکان تا دەگاتە جێگا دابین کردن .. بەرانبەر بەمە تۆ چاوەروان هیچ پاداشت و گەرانەوەی پارەیەک نیت چونکە لەلای زۆر هونەرمەند هونەر ئارەزووە نەک کار.. لە کوردستانی ئێمەدا لەبواری هونەردا دەتوانیت کار بکەیت .. چونکە زمانی دایک یارمەتی دابین کردنی کارت بۆ دەکات پاشان وولاتی خۆت ئاسان کاری پتری تێ دایە .. شێوەکاری کورد لە دەرەوەی وولات هەمیشە راکردووی دوو کارە یەک کاری ژیان دابین کردن دوەمیش کاری هونەری ئارەزوو وە ژیان ، بۆیە وا ئاسان نی یە کە هونەرمەند بەردەوام بێت لە کاری هونەری بەتایبەت لە ئەورووپادا هەر ئەوەشە کە وای کردووە هونەرمەندانی کورد لەگەڵ هاتنیان بۆ ئەورووپا یان پاش سالانێکی زۆر واز لە هونەر دەهێنن یان کارێکی تر دەدۆزنەوە یان هەندێک باری تایبەتی هەیە وای کردووە کە دوور بکەونەوە لە دونیای هونەر، لە لەیەکی ترەوە زۆر لە هونەرمەندانی کورد بەردەوامی کارەکانیان وای کردوە لە کەوڵی ناسنامەیی دەرچووە لەبەر گرنگی کارەکانیان لەبەر جوانی کارەکانیان یان لەبەر زۆری چالاکی هەنەری و پێش چوونی باری تەکنیکی کارەکانیان وای لێ هاتووە کە ئەو هونەرمەندە ناوی لە سایدە ئەلەکترۆنی یەکاندا دووبارە بۆتەوە یان ناسراوێتی وای کردوە زیاتر بانگەنیشینی هونەری بکەن لە هەموو چالاکی هونەری یەکاندا .. بەو شێوەیە هونەرمەندانی کورد بەشدارن لە زۆربەی کەلتوورە کانی دونیادا بۆ ناساندنی هونەری کوردی بەو کەسانەی کە تائێستا کوردیان نەناسیوە. ناساندنی کەلتوورێک بە جیهانێکی تر وا ئاسان نی یە ئەگەر رێگەیەک نەبێت بۆ دەربرینی یان خستنە رووی ، لە گەلەری یەک یەن لە مالێک یان لە کافتریاو هۆل و فیستڤاڵ و بۆنەیەک کە تۆ بتوانیت دەربرین لە میللەت و کەلتوورو وولاتەکەت بکەیت بۆ ئەمەش ناسین و دۆستایەتی و پەیوەندی نێو تاکە کەسی یان پارت یان کۆمیتەو دەزگا راگەیاندنەکانی دەوێت بۆ ئەوەی ئەو رێگایە دروست بێت کە هونەری وولاتەکەت پیشانی ئەو جیهانەی بدەیت کەتائێستا ناوی میللەتەکەی تۆی نەبیستوە.

پەنابەرانی کورد یان کۆچ بەرانی کورد لە ئەوروپا چ خۆیان یان منداڵەکانیان لە سەنتەرە هونەری یەکانی سارەکانیان بەشدارن لە کاری هونەری یان فێربوونی هونەر چالاکی رۆشنبیری تەنها لە هونەردا خۆی نەدۆزیوەتەوە بەڵکو لە وەرزش و مەلەوانی و مۆسیقا وکۆرو وێنەکێشان و زۆر کاری تری ئارەزوو مەندانە .. لەزۆر کاردا وولات مرۆڤ دەبەستێتەوە بەیەکتری زۆری تریش ئارەزووی ژیان.

لەزۆرچالاکی هونەریدا بەداخەوە ئامادەبوونی کورد زۆر کەمە .. ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ نەبوونی دەزگایەک کە دەربرین لە یەک نوسینگەی راگەیاندنی کوردی بۆ کۆکردنەوەی ئەو کوردانەی کە دانشتووی ئەم وولاتانەن. لەزۆر بۆنەدا بۆنەیەکی کەلتووری کوردی یە کەچی نائامادەبونیان دەبێتە جێگای پرس و باس بۆ هەمووان ... بێگومان لەکاتی ئامادەبوندا گۆرینەوەی زۆر لە باسی کەلتووری و ئەدەبی دروست دەکات بێجگە لە ناساندنی ئێمە بەکاسانی ئەورووپی .

هونەرمەندانی شێوەکارانی کورد لە ئەوروپا زۆری نەیان ئەندامن لەزۆر دەزگای هونەری ئەنتەرناسونال وە لە دەزگا حکومی یەکاندا وە لە نەقابەکانیشدا یان خۆیان دەستەیەکیان هەیە لەم دەرگایانەوە کاری هونەریان پێشکەش دەکەن زۆر چاو پی کەوتن و تێکەڵیان لەگەل خەلکێ ئەورووپیدا دروست کردووە .. ئێمەی شێوەکارانی کورد ئەوەندەزۆر نیین تا بتوانین رووبەری شاشەی هونەری ئەوروپا بگرین بەڵکو ئێمە تنۆکێک لەئاوی ئەو دەریا هونەرەیین. بەلام تائێستا وەکو کوردستانی ئازاد نمونەیەک لەو هەنەرە پێش کەشی جیهان نەکراوە لەگەل ئەوەی ئێمە سەفارەتمان هەیە وە نوێنەرایەتیمان هەیە بۆ دروست کردنی پردێکی هونەری لەنێوان ئەورووپاو کوردستاندا.

ونەریمان کردوە...مریشک فرۆشێک لە کوردستان یارمەتی رێز لێ نانی هونەرمەندان وەردەگرێت؟

***

## هونەر بۆ مرۆڤایەتی یە نەک بۆ کاک فلان................

ئاشتی گەرمیانی . هۆلەندا

کاک فلان حەز دەکات بۆ یادی نەورۆز پێشانگایەک بکاتەوە.... بەلام بەمەرجێک کەمترین مەسرەفی تێ بچێت، وە تا 30 هونەرمەندی کوردیش لە بوارە جیا جیاکان بەشداری تیادابکەن. ئەمە داوەتی کەسانێکە لە لێپرسراوەکانی هەرێمی کوردستان هونەر بۆ نازناوی خۆی کە بەرپرسەو کاری کردوە ؟؟؟ نەک بۆ رێز لێ گرتنی هونەرو مرۆڤایەتی؟؟؟

مرۆڤی کورد لەسەدەی بیست و یەکەمدایە هونەری هەرێمەکەشی لە گۆران کاری و بەرەو پێش چوون دایە .. خوێندەواری ناوچەکە پاش ئەو هەموو گۆران کاریانە زۆر نانەخوێندەواری ژێر چال کرد .. بوونی میدیاکان و هونەرە جوانەکان و ئاکادیمیاکان و شەپۆلی ئاوەدان کردنەوە و رۆلی تێکەل بوون بە دونیای دەرەوە وای کردوە کە خەلک چاو کزو دابراو نەبن لە هەرێمی کوردستاندابە تایبەت لە ناو دەزگا حیزبی و ئیداری یەکاندا. بەلام بەوەی مەزەنە دەکرێت و لێ ی دەبینرێت وا نی یە بەوەی کە هونەر بۆ مرۆڤایەتی نەبێت بەلکو بۆ کاری وەبەرهەم هێنانی ناوداری تاکە شەخس بێت. باشترین نمونەش ئەوەیە کە پێشانگایەکی هونەری لە هەرێمی کوردستاندا بۆ خۆ ئامادە کردن ئەم تێروانینەی لێ دەکرێت کە هونەرمەندێکی زۆر و چالاکی یەکی ناودار بەلام بێ ئەوەی رێز لە کارو پیشەی هونەرمەندەکە بگیرێت؟
هەر هونەرمەندەکە تابلۆکان دەهێنێت و رەوانەی هۆل و هەل واسینی دەکات هەم هونەرمەندەکە خۆی تابلۆکانی دەباتەوە .. لە کۆتایدا بە سوپاسێک بەرێ دەکرێت ..لەگەڵ ئەوەی ئەمرۆ لە جیهاندا پێشانگا بە کەرنەڤال و مۆسیقاو ئاهەنگ دەکرێتەوە . جۆرەها خواردنەوەو خوارن و ئاهەنگی تیادا دەگێردرێت . کەمانچە ژەنێک بلوێر ژەنێک ئاوازی تابلۆکان دەخوێنێتەوە نەک بە دوا کەوتن بەدوای لێپرساوە حیزبێکە؟

مافی مرۆڤایەتی هونەرمەند زۆر گەورەترە لەهەموو ئەو لێپرساوە حیزبیانەی کە تەنها ووردە کاریان لەسەر ژیانی هونەرمەندەکە نی یە، هەر دەبێت هونەرمەندەکە تابلۆکانی یەک بەیەک بۆ باس بکات چونکە بەرپرسەکە نەخوێندەواری سەردەمە شارەزایی

داهێنانی ئەمرۆ نی یە. ئەمرۆ لە جیهاندا بۆ ئەوەی مافی هونەرمەند بدەین دەبێت چاو پێکەوتنی رۆژنامەنووسی بەئەنجام بگەیەنێت بۆ رێز لە هونەر گرتن نەک رسوا کردنی تەنها بە سەردانێکی زۆر بە پەلە چونکە کاری حیزبیمان هەیە؟
لەسەرۆکایەتی هەرێم یان لە جێگا بالاکان باسی سەرکەوتووی ئەو پێشانگایە دەکەن کە کاک فلان لێپرساوی فلان بە ئەنجامی گەیاندووە . لەراستیشدا کەس گوێ ی لە رەخنەکان و پێشنیارەکانی نەگرت وە کەس ئامادەش نەبوو گوێیان لێ بگرێت بەداخەوە کات نەبوو ئێش الله بۆ کاتێکی تر لە فرسەتێکی تردا....لێپرسراو لەدایک بووی سەردەمێکی سەقەتە کاتی ئەوە هاتوە کورسی یەکنیان چۆل بکەن ، لاو هەیە شارەزاو پسپۆرە بێ واسیدە با ئەوان بێن کار بکەن بۆ هونەرو مرۆڤایەتی و سەردەمی کوردستانێکی ئازادو ئاوەدان . مەرجێش نی یە کە هەموو لێپرسراوەکان ئاوها بن؟
پیرۆز بێت پێشانگای هونەرمەندانی کورد بەو شێوەیە؟؟؟؟؟

***

## بێ باوەری هونەرمەندان بۆ میدیا کوردی یەکان

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

زیز بوونی هونەرمەندانی کورد بەرانبـــەر بە ئەو خزم و خزمایەتی یەی کە لە وەزارەتی رۆشنبیری دا دەکرێت بەرانبەر بە هەمـــوو ئەو نا هەلسەنگاندنانەی کە خزمایەتـــی لێ کەوتۆتەوە،
خاتوو ی گۆرانی بێژی کورد تـــــــارا رەسوول ئەو مرۆڤە ناسکە بە نابینایی وە هەستی بەرزی بەوە کردوە کە وەزارەتـــێک پرە لە گەندەلی خزمایەتی و بـــــــێ داهێنەری و کۆ کردنەوەی کۆنە بەعسی یەکان بێت..من جارێکی تــــــر ئەم رەخنەیەم دوویات کردەوە بـــــەلام ئازاری هونــــەرمەندانی کورد یان پێ شێـــل کردنی مافەکانیان ئەوەندە بەر چاوە ،لەبەر دلــــــــسۆزیمان بۆ ئەو هونەرو کەلـــــتوورە وە ناسنامەیەتیمان وە خەباتی درێژمان لە کوردستاندا بە تایبەت لە رۆژگـــــــارێک کە لە سەنگەرێکدا دژ بە بەعسی یەکان خەباتمان دەکرد..ئەو پێشـــــــمەرگانە ئەمرۆ وان لە دەرەوەی ئەو بازنەیە من ئەم رەخنەیە تاوتـــــــــوێ دەکەم دەلێم بەلکو

لێپرسراوێکی مەکتەبی سیاسی تەنها بیخوێنێتەوە وە لە نزیکەوە ئاگاداری زیز بوونی هونەرمەندانی کورد بێت...چونـــــــــکە رۆژ بەرۆژ دوور کەوتنەوەی هونەرمەندان و زویر بونیان وا دەکات یەک گرتـــــــــووی ئەو میللەتە بە تایبەت لەدەرەوەی وولات لە بواری کەلتــــــــــووردا کەم بکاتەوە..بۆیە دەبێ وەزارەتی رۆشنبیری زۆر بە زانستی کار بکات بـــــۆ دروست کردنی پلانێکی نوێ ی هونەری وە بەرنامەیەکی هەبێت لە سەر ئاستی دەرەوەی کوردستان.

راگەیاندنی کوردی بەراستی لە ئەورووپـــــــــــاو دەرەوەی وولات لاوازە.. بەشێوەیەک کە چەند کەسێک نوێنەرایەتیان دەکـــــــــــات بەراستی دل گیر نین،دلگیر نین لەلایەن زۆر لە نوسەران و هونەرمەندان و رۆشنبیرانەوە وە نەیان توانیوە دەنـــــــــگی خەلکی ئەوروپا بەجوانی بگەیەننە کوردستان لە رێگای چوارچێوەی سەتەلایتەکانی کوردســــــــتانەوە هەر لە کێشەکانیان وە ئارەزوویەکانیان وە دەنگیان. .ئـــــــــەمە بێجگە لەوەی کە رۆژانە لە واسیدە دەگەرێن بۆ پتەو کردنی جێگاکانیان لەو دونیایەی کە تازە کاریان تیادا کردوە کاری راگەیاندن پسپۆری تایبەتی دەوێت بۆ پەرە پـــێ دانی کەلتووری وولاتێک. ئەو پسپۆرانەش خوولی تایبەتیان دەوێت..نمـــونە ..زۆر کار لە ئەوروپا ئەنجام دەدرێت راگەیاندنی کوردی ئامادە نی یە..وە ئامـــادەش نابێت..لەسەر ئاستی داوەت کردنیان من وا دێتە بەر چاوم راگەیاندن بە دوای لقـــەکان ومەلبەندەکانەوەن..نەک بە دوای هونەری کوردی و زمانی کوردی بۆیە داوا لە کەسانی بەر پرسیـــــار دەکەم تۆزێک بیر بکەنەوە لەو راگەیاندنەی کە زیز بوونی تیادا دروســــت دەبێت..بە دوور کەوتنەوەی هونەرمەندی کوردو نوسەری کورد رۆشنبیری کورد لە گۆرەپانەکەدا.

***

## 9سال کار بۆ کوردستان تی ڤی وەرچەرخاندنێکە لە دروست کردنی راگەیاندنی کوردی......

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

Ktv مالێکە بۆ پەنابەران..چرایەکە هەموو ئێواران لەم غوربەتە دا دای دەگیرسێنین و هەموو ئاو هەوای کوردستان خۆشی و ناخۆشی دەگاتە نێو مالانمان...کەم رەوەندی کورد هەیە کە کوردستان تی ڤی تەماشانەکەن و گوێ لە هەوالەکانی و راپۆرتەکانی و گۆرانی کوردی و سینەماو شانۆتا دەگاتە دوا کزی تیشکی بینینەکانمان چاوی لێ نەگرن ..9 سالی خەباتی راگەیاندن بەراستی ئاستی هوشیارو تاقی کردنەوەی دروست کردنی راگەیاندن بەرەو پلەیەکی بەرز دەبات بەتایبەت ئەگەر خوولی راگەیاندنی بەردەوام لە کوردستاندا تاوتوێ بکرێت وەکاری لەسەر بکرێت ..لەم یادە پیرۆزەدا لێرەوە پیرۆز بایی خۆمان دەنێرین بۆ ئەندامانی کوردستان تی ڤی .

لەگەل دەست پێکی سالی 2007 مرۆڤی کورد بێگومان بن وەکو خەلکانی هەموو دونیا چاوەروانی گۆران کاری یەکانی هاودەمە لە تەکنیک و شێوازو دارشتن و مامەلە کردن لەگەل تازەگەری دونیادابە تایبەت لە چوارچێوەی راگەیاندندا..کوردستان تی ڤیش یەکێکە لەو مینبەرە زیندوانەی کە رۆژانە مرۆڤی کورد چاوی لێ دەگرێت.

ئێمە وەکو رەوەندێک لەدەرەوەی وولات چاوەروانی ئەوە دەکەین کە کوردستان تی ڤی تیمە کانیان سەردانی مالانی کورد بکات وە لە نزیکەوە لە خەمەکان و ئازارەکانی ئەو رەوەندە تی بگات..نەک شایی و کۆنسێرت ببێتە وێستگەیەک..هەندێک هەنگاوی جوان هەیە لەم رۆژانەی دوایدا..خەلک پێ جوانە وە ئەوە لاوانی سەردەمی ئەمرۆیە....ktv لە داهاتوودادەبێتە قوتابخانەیەک کە زۆر لە لاوان ومامۆستای راگەیاندن دروست دەکات بە تاقی کردنەوەو کاری رۆژانە 9 سال لە کار پیرۆزی تیادا بەدی دەکرێت.گۆرینەوەی شارەزایی لە نێوان کوردستان تی ڤی و تی ڤی یە جیهانی یەکان باشتین وەرچەرخانە لە ئەمرۆی راگەیاندندا بۆ بەرەو پێش چوونی جۆرایەتی و تەکنیکی نۆێ لە جیهاندا.

نەک تەنها من بەلکو چەندەها چاو ئەمرۆ چاو لە کوردستان تی دەگرێت بەلام زۆر گرنگە ktvبیر لەوە بکاتەوە تەنهاق بە زمانی کوردی دەنگی نەگاتە جیهان بەلکو

پاشکۆی کەنالی کێ بکەوێتەوە بە زمانەکانی ئینگلیزی و ئەلەمانی تا دونیا جوانی کوردستان ببینن نەک شەرو وێران کاری وولاتی عێراق..هیواداریین2007 دەرگای نوێ تر بێت بۆ راگەیاندنی کوردی.

## یەکێک لە کارە هونەری یەکانی حکومەتی هەرێم

تۆ....وەکو حکومەت یان وەزارەتی رۆشنبیری یان بەریوبەرایەتی شێوەکاری یان کۆلیژی ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان یان پەیمانگای هونەرەجوانەکان....سەرۆکی یەکێتی هونەرمەندان سەندیکایی هونەرمەندان...ئێوەی مامۆستایانی پەیمانگا هونەری یەکان یان هونەرمەندانی کوردستان...ئەم پەیکەرە دارێژراوەتان لە ئاستی ئەکادیمی وناوەرەکی و جوان کاری کاری هونەری بەدڵە....؟؟؟

**ئاشتی گەرمیانی......هۆلەندا**

کە هونەرمەندانی کورد لەدەرەوەی کوردستان داوای پرۆژەیەکتان لێ دەکات بێگومان بن بۆ جوان کردنەوەی کوردستانە بە جوانترین کەرەستەوفۆرمی ئەورویی..یان چەند هونەرمەندێک خۆیان بەخش دەکەن بۆ دروست کردنی پرۆژەیەک لە کوردستان ..بەبێ وەلام تا ئێستا لە لایەن وەزارەتەکانەوە پرۆژەکەیان ماوەتەوە..وە زۆر لە هونەرمەندانی تر لە کوردستاندا خاوەن بەرنامەی جوان بوون ، من لە نزیکەوە ئاگادارم کە پێشوازیان لەو بەرنامانە نەکردوە ئەگەر وەریان گرتبێت ئەوا بێ وەلام ماوەتەوە،هەر وەک بەرنامەکانی تر،،

بابلێین جەنابی وەزیر لە هونەر تێ ناگات یان پسپۆر نی یە لەو بوارەدا بەلام خۆ راوێژکارەکانیان هیچ نەبێت ووردە کارێ یەک هەر دەزانن لە هونەر..هەرچەندە من بە راوێژکاری کاتیان دەناسم وە دەزانم ...

چۆن ئەم پەیکەرە لە ناو هەولێرێ پایتەخت دا لەنگەری گرت بە هەموو ئەو کەم و کوریانەوە..کەسێک نەبوو لەو ناوانەی کە باسم کرد وەلامێکی هەبێت یان رەخنەیەکی لێ هەبێت؟ راوێژکارەکانی وەزارەتی رۆشنبیری باس لە کاری ئیتالیا دەکەن ؟؟؟؟باس

لە کاری هونەرمەندی پەیکەرتاش فواد عەلی دەکەن..باس لە هونەرمەندە عەرەبەکان دەکەن لە فلۆرەنساو لەندەن....؟؟بۆچی کوردستان بەبێ واسیدە هونەرمەندی لێهاتووی تێدا نی یە؟پسپۆری شارەزایی هونەری لێ نی یە؟ بۆ ئەوەی پەیکەرێکی لەش ساخ دروست بکات.نەک لەش سەقەت..ئایا کەسێک لە ئەوروپاوە سەردانی کوردستان بکات ئەم پەیکەرە دەبینێت؟

واسیدەکەو برادەری یەکە لەسەر حیسابی وولات بێت یان هونەر بێت؟ئەگەر شارەزا نەبومایە لەو بوارە بێگومان بە کەم و کوریەکانم نەدەبینی بەلام زۆر بەراشکاوانە کەم و کوری یەکان بەرچاوم دەکەوێت..

کورستان پێویست بو زۆر لەپەیکەرو دیوار بەندی هونەری هەیە وەکو ئاوەدان کردنەوە وە پێویستی بەکادرو پسپۆرو شارەزایی هەیە تا کارێکو جوان لە شارەکانی کوردستاندا پیشان بدرێت..نەک پەیکەری سەقەت؟؟؟

## ..هونەرمەندان و مالپەرە ئەلەکترۆنی یەکان..

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

ئەرکی وەزارەتی رۆشەنبیری هەرێمی کوردستانە .. بە ئەرشیف کردن..

دێر زەمانە ..هەر باسە باسی بە ئەرشیف کردنە.. کام ئەرشیف وە لە کوێ وە دەست پێ بکەین . لەو لاپەرانەی کە زەردو بۆر هەلگەراون یان ئەو تەمەن و مرۆڤانەی کە بە سالا چوون و کەس ئاوریان لێ ناداتەوە وە هەر لێشیان ناپرسێتەوە، کە ئێوە چین.. وە پاشماوەی کێن وە لە کوێ وە هاتوون........

سالانی 1983 وە 1984 لە شاری کەرکووک لە کتێبخانەی دەزگای راگەیاندی ناوخۆی زۆر لاپـــەرەو کتێب و پەرتووک و بلاوکـــــــــــراوەی کوردیم بـــینی وەک

ئاڤێــستا و باسەرەو دیوانی هەلبەستی  هەلبەست وانانی کورد. بەلام بەداخەوە هەموو لاپەرەکان زەرد زەرد هەلگەرابوون وە پر لە تۆزو بەرە و هەلوەرین دەچوون،، هەر جار جارکیش رژێم دەکەوتە نێو پەرتوکخانەی کەرکووک و برێ لەو ئەرشیف و مێژووەوە ئەدەبیاتانەبی دەسووتاند.. لە سالانی 1991 وە من کەسێک بووم لەو بەهیوایانەی کە ئیدی وەزارەتی رۆشەنبیری هەرێمی کوردستانی عێراق لە کوردستانی ئــــــــــازادا ئەرشیف و بیبلۆگرافیای  هونەرمەندان و نوسەرانی کورد و بلاوکراوەکانی کورد وەکو بیلبیلەی چاوەکانی دەبارێزت و دەیخاتـــــە نێو تۆری ئەلکترۆنی نوێ ی هاوچەرخەوە.
هەر ئەو وەزارەتە دەیتوانی کارە هونەریەکانی بەشی شوەکاریش لە چوارچوەی بە ئەرشیف کردن و یـەک سەرچاوەی گەرانەوە بۆ هونەری شێوەکاری کوردی بپارێزێت و لە مالپەرێکدا کۆی بکاتەوە.بەلام بەداخەوە جاری واش هەیە هەر تەنها یەک مرۆڤ... خۆی وەزارەتە.. وەهەر خۆشی ئەرشیفە.. وە خۆشی نوێنەرە....
کاتی ئەوەی هاتوەو بەزیادەوە بۆ نیشـــــــتەجێ کردن... ؟؟؟؟ لاوانی نوێ یش یان گەنجانی نوێ یش سووتەمەنی ئەو کـــــارگەیەن کە دووکەلی رەشی لێ هەلدەستێت..
هەموو دونیا  هەر لە مۆزەخانـــەو پەرتووکخانەوە تاوەکو کتێبخانەیەکی بچووک لە گەرەکەکاندا سەروەت و ئالتوونی وولاتەکەی لــە دوو توێی بە ئەرشیف کردندا پاراستوە.. لۆڤـــەرو پاریس بـە پاشماوەی تابلۆ نەمرەکان لەنگەری گرتووە.
ئیتالیا لە شاری فلۆرەنسا پەیکەرەکان و هونەرەکەی ناوی رێنسانس و هاوچەرخی ئەو وولاتەیان بـــەرز راگرتووە. کوردستانی ئێمەش ئەمرۆ دەبێت بیر لەوە بکاتەوە کە لاپەرە ئەلەکترۆنی یەکان وبــــــــە ئەرشیف کردن و پاراستنی کەلتووری کوردی و دانانی پسپۆری هونەری شیاو زەروورەتی هاوچەرخێتـــــــی ئەمرۆی کوردستانی نوێ یە...بۆیە هونەرمەندانی کورد لەسەر هیلاکی و ماندوێتی خۆیان لە ئاکامــــــی بێ ئاکامییان دەبێ هەر یەک بۆ خۆی مالپەرێکی ئەلەکترۆنی دروست بکات ئەگەر تەنها یەک سال و دوو سالیش بـــێت لەو مالپەرەوە دەنگی دەگاتـــــــە دونیا. ئێستاش سەرەتایەکە لەو هەنگاوە پیرۆزە کە هونــــــەرمەندان هەنـــــگاوی بۆ دەنێن و بە زمــــانە جیاوازەکان بابەت و چالاکی یە هونەری یـە کانیانی تیادا بلاو دەکەنەوە.
دروست کردنی مالپەری ئەلەکتــرۆنی بە تایبەت بۆ کەلتوورو هونەر لـــە ئاستێکی بالادا خۆی لە خۆی دا بە ئەرشیف کردنێکی هاوچەرخی یە.و ناساندنی هونــــەرمەندانی کوردو چالاکی یەکانیانە.....لە تـــــــۆری ئەنتەرنێتدا وەکو کورد زۆر کاری باش کراوە وە هەندێ شـت کراوەتە ئەلبووم و ئەرشیـــــف بەلام ئەوەی من

باســـی لێوە دەکەم دەزگایەکی گەورەیی بێ کۆتایی یە کـــە زۆر لاپەڕەی کۆن و زەرد زیندوو دەکاتەوە وە لە مردن ئەیان هێنێتەوە ژیان...

***

ئازارێک لە گەرمیانەوە..کەم کەس لێ ی تێ گەیشت..هونەرمەندی شێوەکاری کۆچ کردوو غازی مەحەمەد..

**.......ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا...**

هونەرمەندی شێوەکاری کورد غازی مەحەمەد ئەمین لە سالێ1954 لە گوندی قەشقە ی سەر بە ناحیەی قادرکەرەم ی پارێزگای کەرکووک لە دایک بوە.قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لەشاری کەرکووک تەواو کردوە.سالانی هەفتاکان کۆلیژی ئابووری زانکۆی سلێمانی تەواو کروە..

زۆر ئازار کۆتایی نەهات لە کۆتایی بەهارێکی لەش سەوزدا کە مرۆڤێکی هونەرمەندی شێوەکاری تیادا سەر گووم کرد بە ئازارێکی تایبەت کە نە لەپلاندا بوو وە نە مرۆڤ باوەری بەوە بوو کەوا زوو ئەو هونەرمەندە کۆچ بکات و شاکارەکانی ئازاری گەرمیان ئەمرۆ بێ رووتووش بمێنێتەوە..هەندێک تابلۆ هەرگیز دوبارە نابێتەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا..هەر لە تەکنیک و ئازارو هەست و بیرکردنەوە لەگەل ئەو سەردەمەیدا..هونەرمەندی کۆچ کردوو غازی مەحەمەد..زۆری لە ئازارەکان دەر بری ئەو ئازارانەی کە مرۆڤی کورد لەگەرمیاندا سەدەیەکی دوورە پێوەی دەنالێنێت..هەر لە کەلتوور و فۆلکلۆرەوەتاوەکو تایبەتمەندێتی یەکانی ناوچەی گەرمیان..کەم کەس هەستی بەو ئازارانە کرد کە هونەرمەند غازی دەربرینی لێوە کرد..کەم کەس ئەنفالی گەرمیانی لە چاوانی هونەرمەندا دەخوێندەوە.کەم کەس بەووردی چاوی لە ناوەڕوەکی تابلۆکانی غازی مەحەمەد گرتووە بۆ ئەوەی کارەساتی هەمینی گەرمیان و شوانە بلوێر ژەنەکەو گەرمیانی یە دەم و چاوە چرچ و لۆچەکەی پر لە ئازارسارێژ بکات..

تایبەت مەندێتی تابلۆکانی هونەرمەند غازی مەحەمەد لەوەدایە کە بە شێوەی روالەت و فۆرم گەرمیانێتی مرۆڤی کوردی تیادا بەرجەستە دەکرێت،کارەساتی ئەنفال و وون کردنی هاورێکانی یان کارتێکراوی ناوچەی گەرمیان ئەو هەموو رەنگانەوەیەیی لە نێو تابلۆکانیدا دەبینرێت..لە بواری هەل بژاردنی رەنگەکانگەکانیشەوە رەنگی گەرم زۆر بەئاشکرایی دەبینرێت بەلام دیسان دەگەرێمەوە بۆ ئەو ئازارەی کە هونەرمەند ویستوویەتی دەری ببرێت بەلام بێ کۆتایی خەمەکان ئەوەندە زۆرن لە چوار چێوەیەکدا جێگایان نابێتەوە.

لەبەر گرنگی ئەم هونەرمەندە کۆچ کردوویە کەلە حوزەیرانی2006 دالە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردزۆر پێویستە هونەرمەندانی کۆچ کردوو وەکو غازی مەحەمەد و ئازاد شەوقی و سەروەت سەوز و .......هونەرمەندانی تری کۆچ کردوو لە بیر نەکەن لە کاروانی هونەری شێوەکاریدا..بە تایبەت وەکو رێز لێ نانێک تابلۆکانیان بەرز بنرخێنین..لە هەر دەزگایەک بێت لە هەرێمی کوردستاندا.

ئازاری هونەرمەندی کۆچ کردوو غازی مەحەمەد نەک تەنها شیر پەنجە بوو بەلکو واز نەهێنان لە گوێ گرتن لە ئەلا وەیسی و ئای ئایەکەی عەلی مەردان و سەلاح داودە بوو کە تا ئەوپەری تایبەت مەندێتی بە کارەکانی یەوە دەبینرا.

زۆر کەس گریا بۆ ماڵ ئاوایی دواجاری..تابلۆیەک لە خەم و تەرمێک لە غوربەتی کۆمەلێک ئازاری بەجێماو............غازی ..پێکەنین و..دواهەناسە....

لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە.......

***

## هونەرمەندی شێوەکار   ســـووعاد ســــــتار

ئامادەکرنی ئاشتی گەرمیانی          هۆلــــــــــەنـــــدا

a.chegani@hom.nl

،، لە پاش هەموو گەران و قوتابخانە هونەری یەکان...تەنها پەیکەرسازی دەربرین لـــــە      ئازارەکان دەکـــات..

،، تەکنیک و گەران بە دوای تەکنیکی شێوەکاریدا .. ئارەزوویەکی بێ کۆتایی یە..

هونەرمەندێکی شێوەکاری کە هەموو ئەلبوومی خۆی لە چوارچێوەی رەنگ و کۆتەلدا گرتۆتە خۆ..ئـــەو هونەرمەندەی تا ئەم تەمەنەش سەرقالی نەخشەو پلان و هێلکاری یە بۆ لە دایک بوونی فۆرمێکــــــی نوێ لە ژیانی هونەریدا..هونەرمەند سووعاد ستار لە کەرکووکەوە تا سلێمانی و پاشان بەرەو قوتبـــی باکوور . بێ وێستگەو راوەستان پەی بۆ ئەو تازەگەریـانە دەروات کە تاوەکو ئەمرۆ نەهاتۆتە تـــــۆری چاووی مرۆڤەوە.. ئەو بابەتانەی کە لەدایک دەبن چـــاوەروانی و مەیلی یـــادکرنەوە بۆ رابردوو بـــــۆ بیرەوەری بۆ مـــۆدرن و خەیال ....خەیالی جەنجالی و رارایـــــی زەمەن  وا لە هونەرمەند دەکات کە زۆر داهێنان و تازەگەری لە ژیـــاری هونەری دا تۆمار بکات.. ئەو هونەرەی کە مرۆڤ بە درێژای مێژوو بـــە دوایدا را دەکات ، ئەو کارانەن کە تەنها شایستەی نەمرێتی و وەبیر هێنانەوە بێت...

دونیای لەیەک ئـــالاوی و جەنجالی و خەونـــە پر لەیەک ئالۆزکاوەکان یەک لا سیمای هونەری یە بـــە جـۆرەها رەنگ و شێوەی جیـــا جیا ئەوەش لەو تاقی کردنەوە نـــــــوێ یانەدا دەبینرێ کە هونەرمەند  سووعاد ستار لەم تاقی کردنەوانەی دوایدا سەرقالی بووە و لە چەندیـــن پێشانگادا نمایشـــی کردووە گیانی هونەری ئەو خەونانە ئەوەندە درێژن من پێـــم وایە نەک لە کۆمەلە کارێکدا،، بەلکو لە زنجیرە

کارێکدا کۆتاییان نایەت چونکە ئازاری ئەو خەون و غوربەتە ئەوەندە قووڵە،، مرۆڤ وا بە ئاسانـــــی ناتوانێت لێ ی دابرێت و خۆی لێ دوور بخاتەوە..

سووعاد ستار لەو تازەگەریانەدا هەردەم نۆێ کاریەکی تیادا رووی داوە بەو کارە نوێ یانەی کە بەردەوام لە پێشانگاکانی باکووری هۆڵەندادا پیشانی دەدات،، بە تایبەت لەسەر ئاستی رێکخراوە هونەری یەکان لە زۆربەی پێشانگا گشتی یەکانی رێکخراوی aida و nederland و هونەرمەندانی عێراقی وە بەم دوایی یەش یەک گرتنەوەی چوار هونەرمەندی کورد لە پێشانگایەکدا..

لاپەرە هونەری یەکانی هونەرمەند سووعاد ستار لە شاری کەرکووک و بەغداوە دەست پێ دەکـــــــات بە تایبەت تاقـــی کردنەوەکانی لەگــەڵ شانۆیانی هاوچەرخی کەرکووک وە گەلــەری هونەری نوێ ی کەرکووک. سالانی 1970کان بە دواوە بۆ مامۆستا سووعاد ستار بیرەوەری و یادگاری یەکی گرنگی ئـــەو سەردەمە بوو.. پاش بە جێ هێشتنی کەرکووک و گیرسانەوەی لە شاری سلێمانی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بوو بە مامۆستای پەیکەر سازی شان بە شانی مامۆستا حیکمەت هیندی و دارا حەمە سەعـــی ئەرکی فێر کردنی قووتابیانی لە بواری پەیکەر سازی گرتوبوە ئەستۆ. بەشداری لەگەڵ هونــەرمەندانی کوردستان و پێشانگا تایبەتیەکانی وای کردووە کە هەردەم ئامادەیی ئەو هونەرمەندە لەبــــیر نەکرێت چاپەمەنی یە میدیایەکانی کوردی و بیانی یەکان بە تایبەت هۆڵەندی پتر گەری هونەرمەند سووعـــاد ستاری بەرەو پێش بردووە.

تابلۆو پەیکەرێکی زۆر .. ئەو هونەرمەندەی کە هەرگیز ترسی لە پەیکەردا شکاوە وە بەــــێ تــرس گەورەترین لا دار ووشک دەکاتەوە و بەر گیانی هونەرو بابەتی جۆراو جـۆری دەهێنێ.. ئەو لاشــــــە بەردو دارانەی کە لە ئەورووپادا ئاسان نــــــــی یە بۆ گواستنەوەی ئەم گەلەری بۆ ئەو گەلەری .. ئەم هونەرمەندە لە باکووری هۆڵەنداوە دەیانگوازێتەوە بۆ ناو گەلەری و هۆڵەکانی رۆژئاوای هۆڵەندا،،

مامۆستای هونەرم سووعاد ستار زۆر تاقی کردنەوەی جیا جیاو بیرەوەری جیا جیای هەیە لە کاروانـــــی هونەری شێوەکاری کوردیدا .. هەردەم ئامادە بووە لە چالاکی هونەری کوردستان و دەرەوەی کوردستان بابەتی کارەکانیشی پتر ئەو قوتابخانە هونەری یە وەکو باسم کرد نوێ خوازی هونەرو هاوچەرخێتیەکی هاودەم کە ئەمرۆ دونیای هونەری شێوەکاری جیهانی پەیرەوی دەکات .

پەیکەر سازی لەلای هونەرمەند ژیانەوەی ئەو کۆتەلانەیە کە مردوون و هونەرمەند دووبارە ئەی هێنێتەوە ژیان بۆ دەربرین لەو مردنە کە ناوەروەکەکەی سادەیەو هیچی تیادا نی یە.. نەمرێتی تابلۆکان ژیانەوەی رۆژگارێکی تالن کە بەردەوام مرۆڤ لە بیری ناکات و وێنەیان لە خەیال و تابلۆو پەیکەردا دەکێشێت.. ئەویش تازەگەری یەکانی هونەرمەند سووعاد ستارە..

***

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە....
## کارو چالاکی هونەرمەندانی کورد لـــە گەلـــەری زامـــوا..............

**ئاشتی گەرمیانی.هۆلەندا**

کۆنە خەونێکی زۆر بەتام و چێژ، بەردەوام لە خەیالی هونەرمەندانی شێوەکارانی کوردا هەبوو.. ئەویش بوونی گەلەری و مۆزەخانەو هۆلی هونەری..کە ببێتە ژوانێکی هونەری و هەموو هونەرمەندانی کـــــورد بەلاو و پێشەواوە کۆ بکاتەوە..کۆ بکاتەوە لەو خالە هونەری یەدا کە چەندین قوتابخانەو رێبـــــازو تەکنیکی نوێ و ریالیستی سەردەمی تیادا هەل قولاوە..

بە ژیانەوەی ئەو بالەخانەیەی کە ئەمرۆ چەندین تابلۆی جیاجیای تیادا نمایش کراوە.. مرۆڤ کاتێک  سەردانی گەلەری زاموا دەکات زۆر تابلۆو هونەرمەندی دۆست و ناسیارو ناودار و لاوی هونەری خوێـــن گەرمی تیادا دەبینێت .. هونەرمەند رۆستەم ئاغا پێش 14 سال لەمەو بەر بە گەرم گووری هونــــەر لە هەولێر دەمبینی زۆر سەر قال و پر دۆسیە بوو..ئەمرۆش لە سێبەری زامواداا هەر ئەو هونەرمەندەیە کە چۆن بەجێم هێشت ئاوهاش بینیمەوە..بە سەر قالی و گەرم وگوری خاوەن زۆر لە پلان بۆ خزمەتـی کەلتووری کوردی و هونەری شێوەکاری کوردی.. هەر لە زاموا چەندین قوتابخانەی تایبەتی و تەکنیکی جیا جیا زۆر داهێنانی گەورە دەبینی..

لە سالی 2000 سەردانی مۆزەخانەی لۆڤەرم کرد لە پاریس و ئەو تابلۆیانەم بینی کە پێش بیست  و پێنچ سال لەمەو بەر لە شاری سلێمانی لە دووتوی کوراسەو بلاوکراوەیدا دەمبینی خەونێک بوو کـــــە مرۆڤ لە راستیدا ئەو تابلۆیانە دیدە بکات

وه لیيان وورد بێتەوه .. جارێكی تر كه گەرامەوه بـــــۆ سلێمانی و كاری هونەرمەندانی كوردم له گەری زاموا بینی ئەو كاتەش ئەم بۆچوونەم هەبوو.

كاری هونەرمەندانی كورد كەمتر نی یه لەو تابلۆیانەی كه لەو مۆزەخانەیەدا دانراوه بگره گـــــەوره تریشه... بەلام تێروانین لەوەدایه تابلۆیەكی لۆڤەر له چوارچێوەیەكی گران و نەخشەكێشراو پیشـــان دراوه .. ئەگەر كاری هونەرمەندانی كورد لو چوار چێوەو بریقه دارەدا پیشان بدرایه بێگوومانــــــــم ئاستی هونەری كەمتر نی یه لەو كارانەی كەمرۆڤ له مۆزەخانەكانی ئەوروپادا دەیان بینێ..كاتێـــك كه دەڵێن چوارچێوه نیوەی تابلۆیه گومانی تێدا نی یه..

بۆیه له زۆر كاری هونەرمەندانی كوردا ئەو داهێنانه بەدی دەكرێت وه له قۆنـــاغی هونەریشـــــدا زۆر قوتابخانەجیا جیای لێ بۆتەوه.. وه زۆر دوباره بونەوەو فەنتازی هونەری تیادا بەدی دەكرێـــــــت.

ئەوەی جێگای سەرەنج و تێوانینم بێت ئەو ئامادە بوونەیه كه رۆژانەو سالانه هونەری شێوەكاری كوردی بەرەو پێش چوونێكی بالا به خۆیەوه دەبینێت..وه كاری هونەرمەندان له زیاد بوندایه ..وه زۆر لاوی خاوەن بەهرەی تیادا هەل كەوتووه.. به تایبەت بوونی پەیمانگای هونەره جوانەكان له سلێمانـــی و ئەكادیمیای هونەره جوانەكان ..وه بوونی هونەره جوانەكان له كەركووك و هەولێرو دهـــــــــــۆك.

كه ئەمه خەونێكی رەنگاو رەنگه... بۆیه گەلەری زاموا هەنگاوێكی هاوچەرخانەو مۆدرانەیه لـەهاتنه دیی ئەو خەونەی كه دەمان بینی .. پیشان دانی تابلۆكان وەفایەكه بۆ ئەو پیاوەی كه هەمـوو ژیانی یان مال و بیرەوەریەكانی بوو به گەلەریەكی هونەری ... هونەری هاوچەرخی مامۆستا ئیبراهیـــــــم ئەحمەد..

زۆر له هونەرمەندان شەو رۆژیان كردەوه بەبێ نان و خۆراكی رۆژانه..تەنها بۆ له دایك بوونــــــــــی تابلۆیەك دەربرین له هەندێ ئازاری جیاجیا بكات.. یان كەلتووری كوردی له دوو توێ ی تابلۆیەكـــدا بپارێزێت.هەولی برای هونەرمەندم رۆستەم ئاغا زۆر گەورەیه لەوه گەورەتر ئەو مرۆڤانەیه كـــــــه توانیان بەشێك له ژیان و بیرەوەیەكانیان پێشكەشی هونەرمەندانی شێوەكارانی كوردستان بكـــــەن. بەو مالەی كەناوی لێ نراوه گەلەری زاموا..

***

## هونەرمەندی پەیکەرتاش دارا حەمە سەعی

کوردستان وولاتی پۆلیسە..نەک هونەرو ئاوەدان کردنەوە

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

هەموو ئازارەکان لێرەوە لە کوردستانەوە دەست پێ دەکات..ئەو مرۆڤەی کە 40 سال ژیانی لەناوهونەری پەیکەر تاشیندا بەسەر برد وە تاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە لە کاری هونەری لێرەو لەوێ..زۆر کەم کەس ڕێز لە هونەر دەگرێت وە دەزگا هونەری یەکان لە کوردستاندا بۆتە دەزگایەکی حیزبی تەنها ناوی هونەرمەندان تۆمار دەکەن..بێ بایەخ ترین شت لەوولاتی ئێمەدا ڕێز گرتنە لە هونەرمەند بە مانایی ڕاستی..ئێمە ئەکادیمیین وە شارەزایی وولاتانی دەرەوەمان هەیە لەماوەی سالانێکی زۆردا ..هیچ حیسابێکی ئەکادیمیشمان بۆ نەکراوە...پارە لە بیناو تەلاری گەورە گەورەدا سەرف کراوە بەلام ئامادە نیین بە هیچ شێوەیەک خزمەتی هونەر بکەن لەم شارەدا وە کوردستان بە ڕاستی..مرور کاتێک جەزای خەلک دەدات ئەو کاتەی شەقام و شارەوانی بە تەواوی لە هێماو ڕاست و چەپ و خەتی پەرینەوە ودوو سایدی شەقام ئسفەلت کرابێت..بۆ هونەرمەندانیش هیچیان نەکردوە داوای شتی زۆری لێ دەکەن بێ ئەوەی تەنها کەرەستەیەکی تەکنەلۆجی سەردەم هەبێت....چەندەها خەلک خەلکی ناشارەزا سەردانی دەرەوەی کوردستان دەکەن تا ئێستا پەیکەرتاشێک نەچۆتە دەرەوەی وولات بۆ کاری زانست ..ئێمە دەبیت لە چاوی مرۆڤایەتی یەوە تەماشای دەوروبەری خۆمان بکەین ..بەتایبەت خۆرهەلاتی دەریای ناوەڕاست شتێک نی یە ناوی تایبەت مەندێتی بێت لە هونەردا بە تایبەت هونەری کوردی..ئێمە لە ئێرانەوە نزیکین بەلام فارسیش نیین..

نامەوێت زیاتر باسی ئازارە دیارەکانی هونەرمەندی پەیکەرتاش و مامۆستام دارا حەمە سەعی بکەم...بەلام دیارە لە ئەنجامی چاوپێ کەوتنەکەی لەگەل کاک شێرکۆ جەلال بۆ ڕۆژ تی ڤی پر بوون لە ئازاری جیا جیا..پاشماوەی حزبایەتی وای کردوە کە کەسانی تر یان جیا جیایەک لە ناو هونەرمەندانندا دروست بکات.

کەسانی ناشاز بین بە پالەوانی گۆرەپانەکە..پسپۆرێک وەکو دارا حەمە سەعی دەبوایە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و شێوەکاری کار بکات و پلان دابنێت..بەلام زۆر بەداخەوە لە هەرلایەکەوە ئێمەباسی کەم و کوری هونەر بکەین لە کوردستاندا کۆتایی نایەت..من

ئەمە بە گەندەلی سەردەمی دەزانم..کۆمەلێک راوێژکاری هونەری تازە مۆدە سەریان لە کوردستاندا هەل داوە کە مل کەچی دوو دەزگا هونەری یەکەن...هیچ پەیامێکی هونەریان پێ نییە ...نمونەی هونەرمەند دارا حەمە سەعی وەکو سومبلێک لە کوردستاندا هەر دەمێنێت........تا ئەوان خاوەن ئەو بۆچونە بن.

***

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە....

### هـــونەرمەندی شێوەکـــار ...عـــەلـــی لـــەتیـــــف....

**ئـــاشتی گەرمیانی**
**هۆلـــــەنـــــدا**

ـ رەنگەکانیش.. لەکوردستانەوە کۆچیان کرد بۆ غوربەت ـ

ئەو هونەرمەندەی کە هەردەم بە زمانێکی کوردی و پەتی و گالتەو پێ کەنینەوە لە گەلەری یەکانی ناو شاری سلێمانی و یاریگای وەرزشی سەرقالی راهێنان و باسکەو مەدالیای یاری زانان بووە..
ئەو هونەرمەندەی کە بە چاوێکی ووردو چرو پرەوە لە دەم و چاوێکی دەرواند.. ئەو رەنگای کە نەسوور و نـە زەردە.. کەچی ســوورو زەردو مــۆر بــوون لە تابلۆیەکی پان و پــۆرو ،، ناوەروەکـــێکی بە ئازار..
هونەرمەندی شێوەکار مامۆستا عەلی لەتیف خاوەن دونیایەک لە تاقی کردنەوەی رەنگ و فـــــــۆرم. قوتابخانەی هونەری لە ریالیستی و ئەکادیمی یەوە بۆ دەربرین خوازی و پاشان سوریـالی و پاشــــان نوێ خوازی هونەری هاوچەرخ.. کەم پێشانگا هەبووە ئەم هونەرمەندە ئامادە نەبوبێت، کەم قوتـابـی و هونەردۆست هەیە ووشەو پەیوەندی یەکان و جولەی ئەم هونەرمەندەی نەزانیبێت لە دونیای هـــونـەری شێوەکاری، کە هەر لا گۆشەیەک لە ناو شاری سلێمانی ،سێ چوار کەس دەورەی ئەم هونەرمەندەیـــــان

دەدا.. بۆ تێروانینێک لە دونیای هونەری شێوەکاری کـــــوردی بۆ جولانەوەی ئەو ئـــارەزوانەی کەمرۆڤ دەبەستێتەوە بە ژیان.. وەرزش هیوایەکی زۆر گرووا جەستەیە تاوەکو ئێستاش لەلای هونەرمەند عـــەلی لەتیف. کە باسی هونەری شێوەکاری کوردی دەکرێت دەبێت ئێمە هەرگیز تابلۆکانی هونەرمەندمـــــــان لە یاد نەچێت، ئەو تابلۆیانەی کە لە سلێمانی و هەولێرو دهۆک لە بەغـــدا ئامادەی زۆربـــــــــەی پێشانگا گشتی یەکان بوو.

بریار دانی چالاکی هونەری شێوەکاری کوردی لە شاری سلێمانیدا هەلبەتە ئەم هونەرمەندە ئەندامێکـــی چالاک بوو بۆ خزمەتی کەلتووری کوردی و زمانی کوردی و خەباتی کوردی، زۆر جار تابلۆیەک لەووتارێکی سیاسی سیاسەت مەدارێک کاریگەرترو تیژ ترە. بۆیە ئەو پەیامەش لەلای هونەرمەند عەلی لەتیـــــف ئاشکرایە... بوونی لە وولاتێکی وەکو ئەلمانیا بەو هەموو چالاکی یە هونەری یەوە بێگومانم کە رۆلـــی ناسنامەو بالیوێزیەک دەبینێ بۆ کوردستان.بریاری کۆچێکی درێژ خایەن و دوور کەوتنەوە لە چیاکانـــــی کوردستان دیارە کارەساتی زۆربەی ئەو کۆچ بەرانەیە کە ئەمرۆ لە قوتبێکی نامۆدا نیشتەجێ دەبـــــن و ژیانی تیادا بەسەر دەبەن .. ئەو قوتبەش تابلێ ی ساردە لە هەموو لایەکی ژیانداریدا..لەرەنگ لەدەنـــگ لە هەلس وکەوتدا.. بۆیەهونەرمەند کاتێک لە کوردستان بوو پتر رەنگی گەرمی بەکار دەهێنا وە فۆرمـــی دەم و چاو کەس و تاکە کەس و چوار چێوەی چاوەروانی لە هەندێ تابلۆی بێ پێوانە لە گەورەیدا ئەرشیفی کارەکانی بوو.

ئەو تابلۆیانەی کە هەرگیز لە چاوانی من و کەسانی وەکو من ناسرێتەوەو ،، ئەوەندە کاریگەر بوون لـــەو سەردەمەدابە سێ و چوار جاریش تێرمان لە چاو بری رەنگەکان نەدەبووەوە. هەر بۆیە ئەو ئێوارەیە و تاوەکو کۆتایی پێشانگاکەی هەر ئامادەیی خەلک زۆر پرسیاری سەیر سەیریان دروست دەکرد ؟؟ ئایا ئەمە پێشانگا بوو یان خۆ پیشاندانێکی رامیاری رۆمانسی رەنگ و مێشکی عەلی لەتیـــــف بوو. ئەمە درامایەکە یان کارەساتی سەردەمی شەرو وێران کاری و ئەنفال کراوی..

ئەو رێبازەی هونەرمەند عەلی لەتیف بە راستی لە رووی فۆرم و ناوەرۆک و شێوەوە قوتابخـــــــــانەیەکی تایبەت بوو وە ئێستاش ئەو قوتابخانەیە درێژەی هەیە بەو 500 و 600 تابلۆیانەی کە لە گەلـــــەری یەکەیدا ئامادەیی کردووە وە بەردەوام چالاکی هونەری لە وولاتی ئەلمانیاو وولاتەکانی ئەوروپا دابـــــــە ئەنجام داوە بێجگە لەوەی کە هەموو میدیا ئەوروپی یەکان بە تایبەتی ناو ئەلمانیا لە ســــــــــەر ئەم هونەرمەندە

دەنووسن و تابلۆکانی بلاو دەکەنەوە..هونەرمەندانی کورد هیچ کەمتر نین لەو هونەرمەندانەی کە کارە هونەری یەکانیان لە مۆزەخانە جیهانی یەکاندا پیشان دەدرێن ..لە چەند مۆزەخانەیەکی گشـــتی ئەوروپی دا تابلۆی هونەرمەند پیشان دراوە.
ئەگەر بە زنجیرە تێروانینی شێوەکاری لەسەر ئەم هـــــــونەرمەندە بدوێیین من بێگومانم کەسێکی وەکو هونەرمەند عەلی لەتیف پێویستی بە پێنچ تا شەش زنجیرە باسی هونەری هەیە لە تێروانینی کـــــارە هونەری یەکانی ، کاروانی هونەری عەلی لەتیف هێلێکی تەریبی بێ کۆتای یە لە هونەری شێـــــوەکاری کوردیدا www.world.art.galerie.de

***

## لە ئەرشفی هونەرمەندانی کوردستانەوە...........

### هونەرمەندی شێوەکاری کۆچ کردوو
### ســــــەروەت ئــەنوەر ســـــــەوز

ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی
هــــــــۆلـــــــــەنــــــدا

ـ کۆتایی هاتـــن..بەو تابلۆیانەی کە ئازارەکانیان بێ کۆتایی بوون...
ـ تەنـــها .. رەنگ و گرافیک .. خەمەکانی دەرەواندەوە...

لە هەموو کۆرو کۆبونەوەو دانیشتنێکدا.. جێگای دوو کورسی خالی یە..لە هەموو دەنگ دانێکی هونەریدا دوو دەنگ کەمە.. لە هەموو پێشانگای هونەرمەندانی کوردستاندا دوو هونەرمەند کەمەو ئامادە نین. لە هەموو ئازارەکاندا دوو جۆری ئازار کەمن و وونن.ئەگەر سەری کێلی قەبرەکانیان هەل بدەینەوە تــەنها رەنگ و ئازارو تابلۆ دەبینی .نەک ئێسک و پرووسکی لاشەی مرۆڤ.
یەک مامۆستای جوانە مەرگ هونەرمەند ئازاد شەوقی وە دووەم ئەستێرەی هونەری شێوەکاری کـــــوردی کۆچ نەکردووی دلمان سەروەت ئەنوەرە کە هەمیشە هاوتایی نەبوو لە هونەری کوردیدا..بەداخەوە زۆریش کەس نەیتوانیوە تا ئێستا بەشێکی بچووک لەو ئازارانە و ماندوێتی یەی هونەرمەندان بداتەوە نــــە وەزارەتی رۆشنبیری

وه نه یەکێتی هونەرمەندان و کۆمەڵەی هونەرمەندانی کوردستان.. چونکە ئـــــەو هونەرمەندانە پر لە هونەرو ئازارو داهێنان و تازەگەری بوون لەو کاروانەی کە تا ئێستــا درێـــژەو بەردەوامی هەیە.. ئەو هونەرمەندەی کە تاکە کەس بوو لە ساڵی1980 لە شاری سلێمانی وێنـــــەی سلایت واتە دیا بشواتەوە بۆ کارت ..وە لە چوارچێوەی خۆی بگرێت .. هونەرمەند سەروەت ئـــــەنوەر زەردەخەنەیەکی مـــات و پر لـــە تابلۆ ،چاو تورکاندنێکی پر لە خۆشەویستی ..بێ دەنگی یەکـــی زۆر ..پر لە شەرمەزاری ..یادگاریەکانی هونەرمەند لەگەل هونەرمەندانی کورد زۆرو پرو چریش بـــوون سەرێکی قال و کۆمەلێک ئازاری شاراوە.. بیرەوەریەکی زۆر لە کۆلەکەی هونەرمەند دایە لە هاورێیانـــی بیرەوەری وەک قـــەرەنی جەمیل و حەمیـــد جەمال و مەتحەت کاکەیـــی و ئیسماعیل خەیات..هـــتد.

جارێکی تریش بە داخەوە بۆ ئەو کۆچە بێ ئاکامە .....بەلام بە داخیشەوە بۆ ئەو رێز لێ نەگرتنـــەی کە تەنها مەدالیایەکی پەیکەریش هەل نەواسراوە لە هۆلە هونەریەکانی کوردستان تەنها ئـــــــەو مەدالیایە دەبوایە دەبووە وەفایەک بۆ هونەرمەندێکی شێوەکاری کوردستان کە لە کاروانی هونـــــەری و کەلتووری مال ئاوایی لێ کردین، هونەرمەندێکی چرو پر لە کەلتوورو فۆلکلۆرو پۆرترێت و دونیـــــــای پر لە رەنگ و هەندێ تاقی کردنەوەی جیا جیا کە تەنها لەگرافیکدا ئەو پتر پەیی بۆ دەبرد.

هەندێ دەم و چاوی باریک باریک و لەگەل پەنجەی وورد..دەم و چاوو ریشێکی سپی،، نەخشەی لەشێکی پارچە پارچە کراو ئەمانە خوێندنەوەی ناوەروەکی تابلۆکانی هونەرمەند سەروەت ئەنوەرە کە تا لـــــە ژیاندا بوو .. هیچ کات بێ بەرهەم وکاری هونەری نەبووە.بێ بەرهەمی لای ئەو هونەرمەندە ســـەردان بوو بۆ چیاکانی پیرەمەگروون و گوندەکانی هەلەدن و شەدەلە و کۆتەل بەکامیراکەی دەستی وە چـــاوی وێنەی ئەو سروشت و بابەتانەی دەگردکە مردوبوون و ئەو جارێکی تر دەی ژیاندەوە دەبوون بـــــــــە پارچەیەک لە تابلۆ بۆ خزمەتی مرۆڤ و مرۆڤایەتی..

کارە هونەریەکانی رێبازێکی ریالیستی دەربرین خوازی وە فۆرمی ئەو دەم و چاوانەی دەکێشا کە پتـــــــر لە کاری گرافیکەوە نزیک بوون وە لەو بوارەدا سەرکەوتوویەکی باشی وەدەست هێنا چونکـــە تاقـــــی کردنەوەیەکی خەستی لەگەل ئەو هونەرەدا هەبوو.

هاوبەشی کردنی هونەرمەند زۆر بوون لەوانە رۆژی هونـــــــەر لە شاری سلێمانی و هەولێر و پێشانگای هونەرمەندانی کوردستان و پێشانگای تایبەتی و هاوبەشی لەگەل

هونەرمەنانی کوردستاندا، بێجـــگـــە لەو هاوبەشیانەی کە لە دەرەوەی وولات بە ئەنجامی گەیاندووە.
پاشماوەی ئەو هونەرمەندە نەک تەنها دەسکێ گوول و مەدالیایی شەرەفی هونەرمەند سەرووەتە ..نـەخێـر کۆمەلێک شاکاری تابلۆی هونەرین کەبێ دایک و باووک ماونەتەوە .. مرۆڤ گریانی دێت کاتێـک تەماشای پاشماوەی هونەرەکەی و جێگا و کورسی یە تاکەکەیی و وێـــنە فۆتۆگرافی یەکانی و پۆرترێتـــــــە دەم بە زەردەخەنەیی یەکەی دەکـــــات .. هەموو دەزگاکان قەرزاری ئەو هونەرمەندەن کـــــەتەنــها لا گەلەری یەک بکەن بە پێشانگای بەردەوامی هونەرمەندێتی سەردەمی هاوچەرخی کوردستان............
تەنهــا پیشان دانی تابلۆکانی هونەرمەندی کۆچ کردوو سەرووەت ئەنوەر سەوز لە گەلەریەکی بەردەوامدا تەنهــــا رێز لێ گرتنێکە بۆ هونەرمەندانـــــی شێوەکاری کورد لە کوردستاندا.؟؟؟؟؟؟؟؟؟

***

## لـــە رقی تۆ دەنگ دەدەم......؟؟؟

### ئـــاشتی گەرمیانی  هۆلەندا

بۆ ئەوەی کە بزانن کە کوردم وە بە کوردی دەنوسم و دەخوێنمەوە...لەبەر ئەوەی کە ناسنامەی کوردم پێ یە و وولاتەکەم ناوی کوردستانە...دەنگ دەدەم و دەچمە سەر پۆستی دەنگ دان ئێمەی کورد من پێم وایە نابێت وا بە زووی لە یـــادمان بچێتەوە کە دوژمنانی کورد هیچ کات پردی شۆرجەی شاری کەرکوکیان بـــــیر ناچێتەوە لە سالانی شەستەکان کە ئەو کات کوردی کەواو سەلتە لەبـــەر دەنگی خۆیان بۆ بوونی خۆیان لە دژی توورکمان و عەرەب بەرز دەکردەوەو داوای مـــافە زەوت کراوەکانیان دەکرد.. بۆ یادی ئەو رۆژانە ئێمەی کورد دەبێت دەنگ بدەین و  بە دەنگ دانی ئێمە هەتاوێکی نوێ لە کوردستانەوە هەل دێت .
منی چیایی و پێشمەرگەی دێرین دەبێ چەکی دەستم ئەمرۆ هونەرو دەنگ دان بێت دەنگ دەدەم لە رقی دوژمنانی کورد کە کوردم.. ئێمەی کورد لە ئەورووپا بەو دەنگ

دانەوە قەلایەکی پتەو بەردینین کە هیچ دەنگێکی تر نەمانروخێنێ و هـــەردەم پێشمەرگەی سەردەم بین بۆ دەنگ دان و پشت گیری کردن لە پرۆســەی بوژانەوەو بەرەو پێش چوونی کوردستان .... من دەنگ دەدەم تا تۆپ زاوا و تــــرکەلان و لەیلان و زەمبوور بگەڕێتەوە باوەشی کوردستان.. من دەنگ دەدەم تا زاب و چیایی حەمرین ساغ بکەمەوە بۆ دوژمنانی بیر تەسک کە وا دەزانن کورد ریشەیی ووشــک دەبێت و کۆتایی دێت میللەتی کورد کە رشە کیش کرا جارێکی تــــر ریشە ووشک کراوەکان چرۆیان دەرکردەوە.. ئەگەر تەمەنی ئەو دارە دووسەد ســــالیش بێت جارێکی تر هەر چرۆ دەکاتەوە هەتا من دەنگی بۆ بدەم..

کە دەنگم دا بیرە وویژدانم ئاسوودەن.. باوەری کوردایەتیم ئاسوودەتر دەبێت.. دەنگ دەدەین بۆ سنووری کوردستان.. دەنگ دەدەین بۆ مانەوەی مرۆڤی کورد لە چیایی ئارارات و دەشتی حەمرین..

من ئەگەر نەچم بۆ دەنگ دان ..ئیدی چۆن ناوی خۆم بانگ بکەم.. چۆن سنووری کوردستان بورووژێنم و جەژنی کورد باس بکەم.. هەموو کەس دەنـگیان داوە.....

بۆچی لەبەر چەند کەسێک؟؟ من دەنگ نەدەم.. من زۆر گەورە تـــرم لەو چەند کەسە من زۆر بەهێز ترم لەو چەند مرۆڤە.. من گەورەترم لە چیاو قـــــەلاکان چونکە لە رقی دوژمنێکی وەکو تۆ دەنگ دەدەم.....

***

## هونەرمەندێک لە کوردستانەوە ... پەیامێکی راستی پێ یە....شێوەکاری کورد ئاری بابان..

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

لە سالانی حەفتاکانەوە بە شێوەیەکی راستەو خۆ گوێمان لە چالاکی هونەری هونەرمەندی شێوەکاری کورد ئاری بابان دەبوو لە شاری کەرکووک...بەتایبەت لە هۆلی هونەری نوی کە کەوتۆتە ناو جەرگەی شاری کەرکووک، بەداخەوە ئەمرۆ بووە بە گازینۆی تاوڵەو دۆمینۆ.

پێشانگای یەکەمی هونەرمەندانی شاری کەرکووک بە ئامادە بوونی وەبە سەرپەرشتی هونەرمەند ئاری بابان بوو ، وە وە گر خستنی پەیوەنی نێوان هونەرمەندان و نوسەران و دانوستاندنیان بۆ دروست کردنی پردێک لە نێوان شارەکانی تری کوردستان ئەو  چاو پێکەوتنانە بوو کە رۆژانە لە شەقامی کۆماری و چایخانەکەی ئەبوعاسی بە ئەنجام دەگەنێردا ...ئەوەی من ئاگام لێ بێت.

سالانی هەشتاکان شاری کەرکووک زۆر چالاکی هونەری بەخۆیەوە بینی لەوانەش پێشانگای دووەمی هونەرمەندانی ئەم شارەوە هونەرمەند ئاری بابان لە شاری سلێمانی گیرسایەوەو بەردەوامی بە کارەکانی دا بە کردنەوەی چەندین پێشانگای تایبەتی و تاقی کردنەوەی چەندین قوتابخانەی هونەری لە سەر کەڤالە هونەری یەکەی..چاوێکی وورد بۆ قوول بونەوە لە دونیای سوریالیەت ، ئەو سوریالیەتەی کە مرۆڤ لەو سەردەمەدا بوبوو بە سوریالیەتی سەردەم ..پاشماوەی شەرو پێک دادانی کوردستان چەندین تابلۆی جیاجیای لەدایک هەل هێنا بە خامەی هونەرمەند ئاری بابان...

من تێ ناگەم بۆچی مرۆڤەکان مل درێژو قاچ باریکن بۆچی جلی کوردی لە بەر مرۆڤی ئەو دونیان..تۆ بلێیت ئێمە حەزرەتی مەسیحمان لە خاچ دابێت..مریەممان سەرگووم کردبێت؟  ئەگەر وا نی یە؟ بۆچی تابلۆکان باس لە بەسەر هاتی سەردەمێکی تاریک دەکەن. هەندێک هیوای تاریک وە هەندێک هیوای ئاوات دار..دەبێت سەرچاوەکەی لە کوێ وە سەری هەل دابێت؟ پاشماوەی سەیرسەیری کوردستان و کاوک کرنیان زۆر لەو ئازارانەی وورد وورد دەکردەوە..بۆیە ئاوازەکەی هونەرمەند ئاری بابان سەدایەکی هەبوو بۆ دوێنێ و ئەمرۆی شێوەکاری کوردی کەبە تایبەتی قوتابجانەیەکە هەمووومان لە ناو ئەو ئازارانەدا خۆمان دەدۆزینەوە.

وە نەبێت هونەرمەند ئاری دوور بێت لە هاوچەرخێتی ئەمرۆی سەردەم زۆر لە کارە هونەری یەکانی ئەو هاوچەرخی یەی تیادا بەدی دەکرێت وە تێکستی مۆدرینی رەنگی تیادایە..زۆر هونەرمەندی شێوەکارمان هەیە بەداخەوە بەنازناو هونەرمەندن بەلام لە کارو چالاکیدا زۆر دوورن لەو دونیایە ..هونەرمەند ئاری بابان سەرای ئەو زەحمەتی و رەنگ دانەوانەی کە رووی دا بەردەوامی خۆی لە کاروانەکەدا وە گەر دیارە وە سالانە چالاکی هونەری خۆی وە ئەنجام گەیاندوە..

ئەگەر خەونەکانی تابلۆی ئەوپەری دونیای سوریالیزمی کاک ئاری راست بوایە..بەراستی تەمەنی من لە 200 سال پتر خۆی دەخوێندەوە ئەوەندە دونیایەکی بەکاریگەرە لەرەنگو سیماو ژیاندا..بەو رەنگانە خۆی بۆ خۆی دەربرینێکی ریالیستی

یە کە دەرونێکی مردوو ساخ بکاتەوە...هەولەکانی هونەرمەندی شێوەکاری کورد زۆر بە سەرکەوتووی دەزانم ..بۆیە من لەم غوربەتە تابلۆکانی رەنگەکانی هێورم دەکاتەوە ............ئازارەکانم دەجولێنێ.. شتێک هەیە لە ناخمدا سیمای غەریبی هونەرێک لە دونیای ئاری بانگەوازەکەی ...... هەفتەی پێشوو .

ئاشتی..هۆلەندا

دوا بەدوای ئەوەی کە ووتمان.. حوکوومەتی هەرێم ئەرکی وەزارەتەکەتانە کە چیتر شەقامەکان و گۆرەپانەکان دوا نەخەن لە ئاوەدان کردنەوە و پەرە پێ دان بە دەم و چاووی شارستـــــــانیەتی هەرێمی کوردستان ...
هەندێ راوو بۆچوونی جیا جیام بە دەست گەیشت بە تەلەفوون و ئیمایل.. لە ئەلمانیا و سوئیدەوە کە زۆر پێویستە ئەم بابەتانە درێژەی هەبێت و بەدوا چوون و ئالووگۆرێکی هونەری بخـــــرێتە بەر چاوی رۆشەنبیران و خەلکی وولاتەکەم..ئەویش یەک لەو مامۆستایانە هونەرمەند فائق نووری بۆچوونی ئەوەی هەبـــــوو کە زەمانە سالانێکی نزیک بەرنامەو ماکێت و شێوەیەکی جوانی پێش کەشی حکومەتی هەرێمی کوردستان کردووە بۆ دارشتن و بوژاندنەوەی یەکێک لە گۆرەپـــــانەکان و سرینەوەی ئاسەواری هەژاری و کاول کاری شەر ..بـەلام بە داخەوە هیواو ئاواتی ئەو هونەرمەندە کوژانیانەوە و بوو بە چرایەکی تـــــاریک و بێ هیوا، بە مەبەستی ئەوەی کە نەوت هەیە چراکە هەلبکەین بەلام درامەتی ئەوە نـــــــی یە تەنها پەیکەرێک لە گۆرەپانێکدا لا راست بێتەوە بۆ جوانی شارەکەو زیندوو کردنەوەی ناوی بلیمەتێکی کـــورد لە لاپەرەی کوردیدا..ئەو خەونە بەبێ چاوەروانی ژێر گل کرا وە هەتا هەتایە هیچ نـــــــامەو سوپاسێکی نایەت بەدوادا،، مامۆستای هونەرمەند فائق تاکە کەس نی یە کە شتی وای پێش کەش کردبێت و پشت گـــوێ خرابێت بەلکو زۆر خزمەت گوزاری تری داهێنەرانی وولاتەکەم هەیە تەنها ســـــــوپاس و (( دیراسەی دەکەین بەبێ وەلام)).
من دیسانەوە دەنگی خۆم بەراشکاوانە بەرز دەکەمەوە بۆ سەرۆکی حکومـــــــــەتی کوردستان ..

بەرێز نێچیرڤان بارزانی ..دروست کردنی مەدالیای رێزو وەفاداری لە گۆڕەپانێکی کوردستاندا بۆ یەکەم بارزانی نەمرو و هاورێکانی .. ئەرکی وەزارەتەکەتانە ئەو پێشمەرگەو سـەرۆکە ئەمرۆ لە هەولێری پایتەخت یان لە بەهدینان یان لە بارزاندا..پەیکـەری رێز لێ نانی بۆ دروست بکرێت و شارستانی یەتی کوردستانی پێ بەرز بکرێتەوە.. چونکە ئێـمەی کورد بە تایبەت هونەرمەندان قەرزاری ئەو پێشمەرگەیەین کە هەموو ژیانی بۆ گـەلەکەی تەرخان کرد.. یان هیچ نەبێت پەیامی ئەو بەرنامەیە را بگەیەنن کە چیـتر کوردستان لە گوندێکی بچووک نەکات و وێنەی ئەو پێشمەرگە قارەمانانە رازاوەی شارەکانی کوردستان بێت،

دووەم ئێمێل..لە هونەرمەندێکی کوردستانی باکوورەوە بە ناوی سەرحـەت شامزینان..

بۆچوونی وای هەیە کە دەستەی هونەرمەندانی کوردستان لـە هەموو پارچەکانەوە هاوبەشی یەکی گشتی بکەن بۆ دروست کردنی لا دیوارێکی هونـەری بە شێوەکاری لە ناو راستی شاری هەولێر پایتەختی هەرێمی کوردستان..تەنها جوانی شاریش کۆتای نی یە بۆ شارستانی یەت هونەری شێوەکاری دەتوانێت ئەرک و رۆلێکی گرنگ ببینێت..دەزگای هونەری شێوەکـاری لە هەولێرو پەیمانگای هونەرە جوانەکان و ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان ئەمانە بەرپرسیارن لەو پلان دانان و رازاوەی کوردستان کە ناوی ئاوەدان کردنەوەی کوردستانە. باباندا بەدی بکەم ..بەردەوامی هونەرەکەی..........لەم ژیانە جەنجاڵەدا.

***

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

رەخنەگری شێوەکاری تـــــاریــق کارێـزی.....

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

ـ رەخنەی شێوەکاری هەگبەی چەند ساڵەمە.....
ـ فەلسەفەو رەخنەی شێوەکارو ئەدەبیاتی کوردی..ژیانێک پێک دەهێنن..ئەویش کاکڵەی نوسەر تاریق کارێزی یە.
ـ رۆژنامەی باسەرە... کۆتایی وێستگەی کـــــارێزی نی یە...

کەم کەس هەیە لە دونیای ئەدەبیات و رۆشنبیری و رەخنەگری شێوەکاری دا بەرێز نوســـــەرو رەخنەگر تاریق سەدیق کارێزی نەناسێت لە بواری نوسین و کورتە چیروک و ووتارو بابەتـــی رەخنەیی هونەری و ئەدەبیاتی کوردی .. لەلایەکی شاراوەش خۆش نووسی و دروست کردنـــــی ئەرشیفێکی گەورەیی هونەرمەندان و بلاوکراوەی کوردی ..پاش خەباتێکی زۆر لە رۆژنامەکانـدا لە سالانی هەشتاکانەوە تا ئێستا ئەو کاروانچی یە هیچ پشوویەکی نەداوە تا ئەمرۆ ، وەکــو سەرنووسەرێک لەرۆژنامەی باسەرە سەر بە دەزگای شەفەق خزمەتی زمان و ووشەی کوردی دەکات تاریق سەدیق لە گەرەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکووک گەورەبووەو لاوێتی خۆی لە نـــــــاو رۆژنامەو پەرتووک و هەلبەست و چیرۆک و رەخنەیی هونەری شێوەکاریدا بەسەر بردوو.
مرۆڤ کاتێک کە دەکەوێتە سەر دووهێلی شەمەندەنەفەری ئەدەب و رۆژنامەگەری لەو دونیایـــە قوول دەبێتەوە و را دەکات و ئەو دوو هێلە ناگەنە یەکتر ، وە قوول و چر تر دەبنەوە لــــــە ناویدا ئەوەندە پتر تاقی کردوەکانی مرۆڤ گەورەتر و چر تر دەبێت لەلایەن دروست کردنـــی ئەو دونیا پر لە زانستە ..کارێزی بێجگە لەوەی کە خزمەتی ئەدەبی کوردی کردووە خزمەتی هونەری شێوەکاریشی زۆر کردووەلە زۆر لایەنەوە.. لەلایەک پێناسەی هونەرمەندانی کورد لە کوردستاندا وە لایەکی ترەوە زۆر جار تێروانین و بۆچوون و رای جیا جیای هەبووە لـــــــە رۆژنامەکاندا.. رەخنەکانی کارێزی دروست کردن و بنیاد نان و گەورەی هونەر بووە، زۆر جـار قوتابخانەکانی

شێوەکاری جیهانی بزواندوە بالی بۆ زۆر لایەنی درێژ راکێشـــــــاوە وە توێژینەوەی لە بارەیەوە کردوە، ئەمەش پتر لە رۆژنامەکانی سالانی هەشتاکان وە بـــــەر چاو دەکەوێت.. هاوکاری و پاشکۆی عێراق و کاروان و رۆژنامەعەرەبی یەکانیش تا برایەتی و خەبات و ئالای ئازادی التاخی و کوردستانی نوێ و کەنالە تەلەفزیونیەکان شاهیدی حالن و کارێزی گاسنی رەخنەو ئەدەبیاتی لە رۆژنامەگەری کوردیدا داکووتاند..

من بە راستی ناتوانم بابەتەکانی کارێزی لە بەرگرنگی شی بکەمەوە وبچمە ناو مێشکـــــی ئەو مرۆڤەوە کە زۆر لە تەمەنی خۆی بۆ ئەو بوارە تەرخان کردووە..بەلام مـــــــن و زۆر لە هونەرمەندانی شێوەکاری تر خۆمان بە قەرزای ئەو مرۆڤە دەزانین کە رۆژگارێک لە تۆپ و ئاسن ئەو مرۆڤە سەری دەکرد بە مالی زۆربەی هونەرمەندەکان لە کوردستاندا بگرە چوون بـۆ دهۆک و هەولێر و سلێمانی تەنها بۆ روون کردنەوەیەک یان بابەتێکی هونەری.ئەو کاتـــــەی من و هونەرمەند دارا مەحەمەد عەلی لاپەرەیەکی شێوەکاریمان لە رۆژنامەی برایەتی بەرێـــوە دەبرد کارێزی توانی زۆر رەخنەو بیرو رای جیا جیای تیادا بلاو بکاتەوە.. کارێزی بێجـــگـــە لەوەی کە ئەو خزمەتانەی کردووە ماوەیەک بوو بە بەریوبەری شێوەکاری لە وەزارەتـــــــی رۆشەنبیری لە هەرێمی کوردستان.. ئەمرۆش لەبەر لێ هاتووی و شارەزایی لــــــــــــــە دروست کردنی رۆژنامەو هونەرو دونیای ئەدەبیات سەرنوسەری رۆژنامەیەکیان پێ سپاردووە لـە رۆژنامەی باسەرە کە لە کەرکووک دەردەچێت..

هیواو ئاوەتەکانی کارێزی زۆر گەورەترن لە رۆژنامەو گۆڤار ..سنووری گەیشتۆتە ئـــــــەوەی کەئەرشیفی هونەرمەندان و زۆربەی زۆری بەلگەنامەی کورد لە پەرتوکخانەکەیدا بیانپارێزێت.

ئەگەر رۆژێک باسی رەخنەی هونەری شێوەکاری بکرێت ئەوا نوسەر تاریق کارێزی یەکیکە لــەو کەسانەی کەوا هەرگیز خەباتی چەند سالەی بیرەوەریەکانی ئازارەکانی و ووتارو چیرۆک و زەردەخەنەکانی هەرگیز لە یاد ناکرێت.

***

# ئافەرین بۆ وەزارەتی پەروەردەی عێراقی عەرەبی لە سایەیی فیدرالی و ئازادیدا

**ئاشتی گەرمیانی .هولەندا**

35 ساڵە لە کەرکووکی کوردستان و کوردا راوو رووت و قەتل و عامی کورد دەکرێت. دەست بە یەخە لەگەل تورکمانەکان و جارێکیش لەگەل عەرەبە شۆڤینیەکاندا ئەمە بێ ئەوەی حکومەت و لایەنەکان دەستیـــــان لەناودا بێت ئەم شەر فرۆشتنە تەنها بیر کردنەوەی شۆفینیەت و گەورە بوونە لەو چوارچێوەیەدا .

ئەوجا من دێمە سەر ئەوەی کە چ دەسەلاتێک لەو دیووی پەردەکەوە هەولی ئاگر خۆش کرن بدات بۆ قــەلا چۆ کردنی گەلی کورد لە بنەرەتدا نەک لەبەر خاتری خاتران یان لەبەر شێخو مشایەخی حەزرەتەکـــــان ئەوانەی کەوا زۆر بە ئاسانی بیرمان نەچێت لە سەر پردەکەی شۆرجەی موسەلا و جووت قاوە لە حەسیرەکە چەند کورد کوژرا و کوا پاشماوەیان وە کوا مافەکانیان وە کێ لەسەریانی نووسی ئەوانە بۆچی کوژران.....

خێلایەتی عەرەب و شۆڤینیەتەکەی لە پال وانەکانی سەیدول الرئیس بەم نەرم نیانەی فیدرالـــــــی عێراق کۆتای نەهاتووە .. وە لەو بروایەدا مەبن کە کۆتایی پێ بێت.. ئەوەتا نمونەم هەیە یەکـــەم لە رۆژنامەی باسەرە ژمارە 96ی 7 نیسان 2005 تا ئێستا بە تەعریب کردن بەردەوامە لـــــــە پەروەردەی کەرکووکدا. بە تورکمانکردن ئەوا هەر بەردەوامە.. مامۆستا گەراوەکانیش هەر لەسەر میلاکـــــی کوردستانن'.. ئەی کوا دەست کەوتەکانی کورد کوردستان لە کەرکووکدا .. تەنها لەسەر ئۆتۆمۆبیلەکانـــــی هاتووچۆ بەکوردی نوسراوە پۆلیسی هاتوو چۆ ئەوە دەست کەوتە لای کوردە سیاسیەکان کە دەیانـــــــەوێ کەرکووک بگەرێننەوە سەر نەخشەی کوردستان..

من لێرەوە زۆر ئافەرین لە وەزارەتی پەروەردە ی عێراقی دەکەم کە هیچ کات دانێکی بە پارێزگای کەرکووک دا نەناوە وە ئەوەی بیەوێت دەیکات بەبێ ترس چونکە وولاتی عەرەبی عێراقی دوو پارچە نابێت.

لە کەرکووک کوردو مەسیحی بە دەرەجەی دووە بە تایبەت لە بواری پەروەردەو دامەزراندنیان رۆژنامـــــەی باسەرە راستی کردووە چونکە هیچ بریارێک لە بەغدای فیدرالەوە بۆ دامەزراندی کورد دەرنەچوە وە بــــــروا ناکەم دەریش بچێت..هەتا

نوێنەری کورد لە کەرکووک هاوار نەکات.. نەک نوێنەری کورد لە بەغـــــــــدا وە نەک نوێنەری کورد لە کوردستان بلێ کوا مافی کەرکووک.

❊❊❊

## کورد .. لە یادی رزگار کردنـی هۆڵەنــــــدا دا...

**ئاشتی گەرمیانی..هۆڵەندا**

ئەم وولاتەی کە بە ژێر ئاستی ئاو ناو دەبرێت Nederlandهەر کات سنگی بەدەم رەشەبایی دەریای باکورەوەیە.. ئا لەم رۆژەدا کە دەکاتە 5 mei سالانە ئاهەنگی لە یەک ئالاوی رەنگو دەنگ و سەماو شایی بۆ ئەو ئاسنە قەیدەی کە ئازادی مرۆڤ لافاوی خەم و عەشقــــی ‌ وولات سنوورەکانی پاک کردەوە لە نازیەکان دەگێرن.

ئا لەم رۆژەدا گەنج و لاو پیر مندال و گەورەو بچووک خۆی بە ناسنامەی ئەم وولاتە دەزانێـت خۆی بە پالەوانی ئەم وولاتە دەزانێت. لە دوو هێز . هێزێکی ئازاد کردنی وولات لە دەســـت داگیر کەرانی نازی. سالانی 19940وە1945 بۆ دوا جار داگیرکەر تێک شکان و وولاتەکەش لە ستەم و ئازارو کۆیلایەتی رزگاری بوو.. ئەوی تریان شایی ئەو دەست کەوتەیە کە لاوانـــی ئەم وولاتە دایان ناوە ئەویش پێش گرتن لە ئاوی دەریای باکوور بۆ ئەوەی هێرشیان نەکـاتە سەر بە دروست کردنی چەندەها پێش گردی کۆنکریتی و پردو ئەستێل.. بەنداوی شــــــار ی رۆتردام دوا نزار بوو کە پێشی گیراو وولاتی هۆڵەندا بە تەواوی ئاسایش کرا لەتـــرســـــی لافاوی دەریا.

بەرنامەی ریکخراوی ئایداو ریکخراوی پەناهەندەیی لەم یادەدا.....

ئەمسال لە یادی 5مایی 2005 دا ریکخراوی ئایدا نیدەرلاند و رێـــــــکخـــــراوی VVN ئەمستردام پلانی ئەو بەرنامەیان دانا کە پێکەوە کایکی تایبەتی هونەری پێش کەش بکەن لە شارەکانی هۆڵەنداداو وەکو 9 هەرێم لە هەر هەرێمێک ئەندامێکی ریکخراوی ئایدا ئامادەیی دەبێت بۆ دارشتنی پلانی هونەری لە گەڵ ریکخراوی VVNدا ئەمەش بە سەرپەرشتــــــــی رێکخراوی ئایدا بەرێز herman dieventaal دا بەرێوەی دەبات .

شارەکانیش . zwola.Fresland.Utrcht Amsterdam
Assen . groenigen wageinging Zeeland.dembosch
بەرنامەکانیش هەر لە رۆژی 5 مایی وە کاتژمێـــر 9ی بەیانی تا 4ی ئێوارە بەردەوام دەبێت .دروست کردنی لا دیوارێکی 4 مەتری کــــــــە پۆستەر یان کارێکی هونەری ئەنجام بدەیت دەربارەی ئازادی وولاتەکەت یان لە هۆلەنــــدا بۆ یادی ئەو رۆژە .

بەشداری کردنی کورد لەم رۆژەدا.....

لە بەرنامەی لیستی ریکخراوی ئایدا نیدەرلاندا ناوی من و هونەرمەند سووعاد ستار هاتــووە کە بەشداری لەو رۆژە فیستڤالی یە بکەین . من لە هەرێمی دەمبووش کە دەکەوێتە خۆرئاوای هۆلونداوە وە هونەرمەند سووعاد ستاریش لە هەرێمی ئاسن کە دەکەوێتە خۆرهەلاتـــــــــی وولاتەوە نزیک بە سنووری ئەلمانیا..
بێگومان تەنها من و هونەرمەند سووعاد بەتەنها نین بۆ بەشداری کردن لەم رۆژە لە کورد یـــان لە نەتەوەی تر بەلکو کەسانی تری هونەری هەن لە بوواری دیکۆرو یان پەیوەندی و شانـــۆو تیاتر و گۆرانی و سەما و هتد.. زۆر جار میللەتی جیا جیا بەشداری دەکەن وەک رۆژئـــــاوای ئەفەریقیاو دەولەتانی وەک سۆمال و ئەریتریاو مەغریب و تورکیا و ئێران و هەندی کەسانـــی تر لە وولاتە ئەورووپیەکان بەشداری دەکەن.
لە پشتی ئەم کارانەوە زۆر هونەر دۆست و شارەزایانی تریش هەیە من بێگومانم کە کـــوردی تریش هەن عەرەبیش هەن وە تورکیش هەن ئامادەی ئەم یادە دەبن چونکە بێجگە لەو هـــــۆ سەرەکی یە کە هونەرو کەلتووری شلیی و خۆشی یە کە ناسنامەیی هۆلەندیشیان هەل گرتـــــوە وە خۆشیان بە بەشێک لەمخاک و ئاوە دەزانن.
بۆ ئێمەی کورد زۆر گرنگە بەشداری کردنمان لەم رۆژەدا چونکە ئەوە دوپات دەکەینەوە کە ئێمـە لەگەل ئازادی و رزگاری هەموو نەتەوە و چین و توێژێکین وە لەگەل ئازادی مرۆڤین وە لەگـــەل دەنگ دان و بیرو رای جیاوازین بۆیە هاوبەشیمان بە رەنگ یان بە هەلەبجە یان بە ئالای کور د و وینە کێشانی ئالای هۆلەندا وە دروست کردنی ئەو پردە ئاسنینەیە بۆ بەستنـــــــەوەی دوو میللەتی جیاواز...

من لەلای خۆمەوە سێ هێلکاریم هەیە بۆ ئەو رۆژە ئەویش هێلکاری نەخشەی هۆلەنداو هاتنــی بۆمبای رەنگ بۆ وولاتەکە. وە ئازادی مرۆڤ و شکاندنی کەلەپچەو چەند وێنەیەک لـــــــــە هەلەبجەی شەهیدەوە . ئەمانە خەرمانی ئەو هەگبەیەن کە دەمەوێ دەنگی کورد دیارییێت.. بۆ دروست کردنی پەیوەندی کوردو هۆلەندا.. هونەرمەند سووعاد ستاریش بێگومان جــــــاری یەکەمی نی یە کە بەشداری بکات بۆ ئەم ئاهەنگ و فیستڤالە بەلکو زۆر بەشداری کــــردوە لە ئاهەنگەکاندا وە بێگومانم ئەویش بەرنامەیەکی تۆکمەیی هەیە بۆ ئەو رۆژە پیرۆزە.....
گرنگی ئەو رۆژە لە چاوی هۆلەندیەکانەوە ئەوەیە کە رزگاری و ئازادی زۆر گرنگە هــــــەر کات یادی بکرێتەوە وە سومبلی رێز لێ نانی بۆ دابنرێت..

***

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

### هونەرمەندی پەیکەرتاش فواد عەلـــــی

**ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی ....هۆلەندا**
a.chegani@hom.nl

ـ تەنها پەیکەر ..نەمرێتی دەدات بەفۆرمەکان ـ
ـ دەنگی دەهۆل و زورنا .. کەلتووری ئەمرۆی گەلەکەمانەـ

هونەرمەندی پەیکەرتاش و پەیکەرساز..کە زۆر لەمێژەوە ناسراوە بەو دەم و چاوە ناسکەی کە تەنها پێکەنین و ئەڤین و خۆشەویستی تیادا بەدی دەکرێت ، ئەو دەم و چاوەی کە زەمانـــــە لە قەلای هەولێرەوە خل دەبووەوە بۆ مچکۆ و پاشان بۆ سەرشەقامەکەی موزەفـــەری یە..قەلای چۆلی وێستگەی ئەو مرۆڤانە بوون کە رۆژێک لە رۆژان دەمان زانی وون دەبن و روو لــــــــە کیشوەرێک دەکەن زۆر بە ئاسانی نادۆزرێنەوە جارێکی تر.
هونەرمەند فواد عەلی کەشکۆلێکی زیندووی پر لە وورتکەو پرتکەی کەلتووری نێو دزەیـــــی و بەرانەتی و خۆشناوەتی و هەلکشان بەرەو لوتکەکانی سەفین و پیرمام..تابلۆ و پەیکەرەکانـــی هونەرمەند گێرانەوەی ئەو چیرۆکەن کە نەک تەنها لە

بەردەم ئاگردان گوێ رایەلیان دەبین بەلکو لە هەموو باس و باس خوازی یەکدا چاوی تیژی لێ دەگریین و جارێک بە رەنگ و جارێکی دیـــش بە ریلیف و مەدالیا، ئازارەکانی دێنە ئازاروو کۆمەلێک خواست و ئارەزووی نــوێ دەخەنە نێو دوو توێێ ی بیرە ماندووەکەمانەوە، ئەو فۆرم و بابەتانەی کە رەشبەلــەکی تۆز هەلگرتووی کـــوردە بەقەف سمێل و پوزەوانە لە پێ و برۆیەکی ئەستوور و دەسکە ملێکی کوردەواری رەســــــــەن، لەلایەکی ترەوە ئەگەر تەماشای رەنگەکانی هونەرمەند فواد عەلی بکەین ئەو رەنگە فێنکانــــە بە لەشی مرقدا تێ دەپەرێت بە پەمەیی و مۆرو سووری کال لە روومەتی کیژۆلەیەکی تازە هەناری پێگەیشتوو دەکات..کە ئەوەندە ناسکە لە جوانی ناسکیدائارنگی لەسەر روونیشتووە.
جل و بەرگێکی کوردەواری کە من لەنێوان پەیکەرو راستیدا نیگەرانی بۆ خـــــۆم دروست کردووە.
ئەگەر ئاورێک لە زورنا ژەنەکەی کاکە فواد بدەینەوە ئەوا دەزانم تۆرەکانی گوێم و زرمە زرمی دەهۆلی خەونەکانم لەو پەیـــکەرە جوانەدا کۆ دەکاتەوە کە سال و زەمانێکە دروست کراوە و لە ژوورەکەیدا هەلواسراوە هەر کەسێک کاتێک چاووی تۆری لێ بگرێت کۆمەلێک بیرەوەری دێتەوە یاد شایی و رەشبەلەکی دەشتی گەرمیان و باسەرە شێخانی و دزەیی..کە هەر هەموو ئەمانە لە چاوانی هونەرمەندا بابەتی جیا جیاو رەنگاو رەنگن .. کوردستان ئەمرۆ پێویستی بە سەدان هونەرمەندی وەکو فواد عەلی هەیە بۆ ئاوەدان کردنەوەی قەلای هەولێر و منارەکەی گۆرەپانەکانی وە نـــەک بەتەنها هەولێر بەلکو هەموو کوردستان پێویستی بـــەو جۆرە ئاوەدان کردنانەوەیە هەیە بەلام بە شەرتێک وەزارەتی رۆشنبیری داوەتـیان بکات .. نەک بە خەیال و کۆنتراکت بۆ مقـــــــاولە بیانی یەکان . ئێمەیی کورد تا سەدەیەکی تریش ئەگەر کوردستان بە پەیکەر دا بریژیین یەشتان ناگەینە ئەوەی کە ئێمە دەسکە گولێکمان رواندووە بـــــۆیە جارێکی تر دەلێم ئەرکی حکومەتی هەرێمی کوردستانە بانگەوازی کادرو پسپۆری کورد بکات بۆ ئاوەدان کردنەوەی وولات.
ئەو رێبازەی هونەرمەند فواد عەلی رەچاوی کردووە بۆ دارشتنی هونەرێکی داتاشینی هاوچەرخ بە تێروانینی من نمونەیەکی مۆدرن و هاوچەرخە لە ئەرشیفی هونەری کوردیدا،، هەر بۆیە زۆر بـــە ناسکی مامەلەی لەگەل ئەو جیهانەدا کردووە بـــە دروست کردنی زۆر لەو پەیکەرانەی کە رووی هەتاوی زەردی باس لە کەلتووری میللەتێک دەکات..ئەو میللەتەی کە هەردەم کەلتوورەکەی بـــە قەدەر زنجیرە چیایی

ئارارات و حەمرین درێژە و کۆتایی نایەت.پەیکەر تاشین نەمرێتی یەکی گرنک دەدات بەو بابەتانەی کە هونەرمەند دەربرینی لێ دەکات بۆیە مانەوەشی تەمەنێکی درێژ تر دەدات بە گیانی بابەتەکە.
هونەرمەند فواد عەلی ئەو پەیکەرە لە خەون و خەیالیدا دەکێشێت کە منارەو قـــەلای هەولێری بە خۆیەوە گرتووە ...هونەرمەندانی کورد لە ئەوروپا چاوەروانی ئەو بریارە دەکەن کە کوردستانی پێ ئاوەدان دەکرێتەوە.

***

## ژ ئەرشیفا هونەرمەندانا کوردستانێ

### هونەرمەندێ شێوەکارو خۆش نقیس زیاد شینۆ

ژ
**ئامادەکردنا ئاشتی گەرمیانی**
a.chegani@home.nl

ـ هونەرا هێل و خۆش نقیسین.. دونیایەکی دیا ژ هونەرێن جیهانێ..
ـ رەنگ و پیتی خۆش نووسین. تێ هەل کێشێکی شێوەکاری یە....

ئەو هونەرمەندێن تم دبێژن ئەزیش ژناڤ هونەرێن شێوەکاریا کوردی قوتابیم و وە تم ژسەر بناغەیین ڤێ رێیدا دمێنم هونەرمەندا شێوەکار و خۆش نقیس زیاد شینۆ...ئیـــــــرۆ ژ ناڤ دونیایەکا نوو دەست و کارێ خو بویە مەشخەلەکـــا هاڤ چەرخیا هونەرا شێوەکاریا کوردیا.. ژ ئالیا بەکار هێنانا نمونەکـــــــــا جیاواز و تەکنیکێن نو ژ کەلـــــــتوورو رەنگێ خو..
بۆیە لەو چیـــاو ئـــاو و هەوایەوە باس دەکەین کـــە مرۆڤی ئەو ساردە چیایانە جۆری بـــیر کردنەوەیان جیاوازی لە هونەرەکەشدا جیاواز ترە..بۆ نموونە رەنگ دانەوەی

یەکەم فۆلکلوری ئەو ناوچەیە وەکو دیاردەیەکی تایبەتی لە ناو کارە هونەری یەکانی هونەرمەندا بەچاو یـان رەچاو دەکرێت لەلایەکی ترەوە رەنگ دانەوەی باری دەروونی ئەو هونەرمەندەو ژیان لە دەڤەری بادینان تیادا دەبینرێت.

دەڤەرێن بادینان ناڤ دەرخستی بەچیایین و گورج و گولین مرۆڤا کورد.. ژ جلکا و بەرگـــــا شێوەیەکە ژ تایبەتمەندیا ناوچەیی، ژبەرڤێ هونەرمەند ئەو تایبـــەتمەندێتی یا ڤەگۆرینا ژبۆ ناڤ تابلۆیین جوان و رەنگین بە هێل و خۆش نڤیسین وە ووشەیا کوردیا .

شینۆ دخوازێت بیژیت بە میللەتێ خۆ ئەزیش کەسێم ژ کاروانا هونەرێن شێڤەکاریین کوردیا بۆ خزمەتا میللەتا خۆ. بەشداری کردنا هونەرمەند ژ پێشانگایێن دەرڤا باوەریەکا مرۆڤایەتیا بۆ هونەرمەندوە بەردەوام بونا هونەرمەند.. ژسەر هونەرو رێبازا هونەریا..ئەو خەویـــــن هین نەهاتینە دیا خو ئیرۆ ژ ناڤ تابلۆیین هونەرمەند شینۆ هاتنە بەرچاڤ..

گەرانەوە بۆ رابردوو یان گەرانەوە بۆ ئەو خەونانەی کە رووی داو مرۆڤ سەرسامە لە ئاستیدا. مۆرک تۆمارێکە لەنێو سێبەری ئەو تابلۆیانەی کەئەمرۆ مرۆڤ سەرقالێتی و هەرەم تۆمـــاری دەکات..لەچوارچێوەی ئادگاری یەکانیدا..ئەو بیرەوەی و یادگـــــارانەی کە هونەرمەند لە نێو خەون خەیالیدا دەخولێتەوە بۆیە هونەرمەند زیاد لەو تاقی کردنەوانەوە دەستی پێ کـردوە کە سەرەنج راکێشەرە لەو تەکنیک و بوارەدا..

پەیامێن هونەرمەند شینۆ ئیرۆ ژ ئەوروپا ئەڤ کارێن بە هێمایین کە شەڤ و رۆژ ژبۆ ل دایـک بونا فۆرمەکا نو خەونێن نو دبینین.. ژ دەسپێکا هونەرییێن هەمی هونەرمەدێن شێوەکایین رێبازا ئەکادیمی و تویژکارییێن بەکاردهێنن پشتێن ڤی درباز دبێت ژ بۆ رێبازا ریالیستی وە دەربرینا هونەریا.ئیرۆش ئەڤ هونەرمەندێن مە زیاد شینۆ ژ ناڤ چوارچێوەیا کارێن هونــــەریا ئەڤ یاسایین هونەریا رەچاڤ کری یە..

جوانی تابلۆکانی هونەرمەند ئەو سروشتە جوانەم لا دروست دەکات کە چیاکانی ئـــارارات و زاگرۆسە لە رەنگ و جوانی و بەکارهێنـــانی تێکەڵ کردنی رەنگ.. کارتێـــــــکراوی ساردی ئەوروپاش لایەنێکە بۆ رەنگ دانەوەی ..بۆیە رەنگی سارد لەکـــارەکانیدا روداوێکەو دیارە وە پەنا بردن بۆ هێل و خۆش نوسیش تێهەل کێش کردنێکە لە نێـــــوان تابلۆ و رەنگ و خۆش نوسین.واتە شێوەیەکی نوێ و هاوچەرخێتی یەکی نـوێ یە لەو کاروانەی کە هونەرمەند زیاد شینۆ ئەی هێنێتە کایەوە..

هونەرمەندێن شێوەکارا کوردیژی ئەو کاروانێن سەروەرێن خەباتا هونـــــەرێین گرتنە بەر رێگایەکا تایبەت وە راستەوخو بگەهێننە ناڤ میللەتێن جیهانێ و دەنگ وە ئازارێن میللەتێن مە ژ رییا هونەرێن..هونەرمەند زیاد یەکێک ژ ئەو کاروانێنە کە ئیرۆ مێژوویەکا درێژ هەنـە ژبۆ خزمەتا هونەرێن کوردیا بە تایبەت ئیرۆ ژ ناڤ ئەورووپایی وە ژ ناڤ قوتبێن باکووراژی..

لەئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە......

***

## بۆچونێک بۆ هونەرمەندانی شێوەکارانی کەرکووک.......

**ئاشتی گەرمیانـــی ....هۆلەندا.**

کەم جار باس و ئاور لە هەندێ بابەتی گرنگ هەیە دەدرێت ئەویش..........

ـ سەد سال لە پاراستنی کەلتووری کوردی کەرکووک.

ـ هەموو شارەکانی جیهان بگۆرێت و لە گۆران کاریدا بێت.. جووت قاوە تابلۆیەکی نەمرە بۆ کەرکووک.

ـ خەمی پارچە پارچەیی کوردستان ..گەرمیان و کەرکووکی سر کردووە. هەر ئەوانیشە بوون بە خۆلەمێش.

ـئاوارەیی هونەرمەندانی کەرکووک ..گریانێکی هێواشە لەم سەردەمە.

هەژاری هیچ کات کەمی نەبووە لە بونیادی مرۆڤ.. مرۆڤی هەژارو دلێکی گەورە.. شارێکی هەژاریش هەیە و سەروەتێکی گەورە..دزێکی زۆرو کەلاوەیەکی وێران.. چەند مالێکی کۆچەرو هەندێکی تـری رماو. نەوتێکی زۆرو تەلبەندێکی قەدەغە کراو.. بەم ووشانە گەرماکەی کەرکووک و زنجیرە چیایە بۆرەکەی وام لێ دەکات جارێکی تر ئەگەر بە تابلۆ نەبێت بە توێژینەوە باسی نەهامەتی سەدسالی رابردوو بکەم.. ئەتوانم باسی پەنجا سالی داهاتووی ئەم شارەش بکەم..کەچی لێ دێت..چـــۆن ووشک

دەکرێت و قەلا چۆ دەکرێت.. بەلام هەرگیز کەس بۆ گیرفانی کەس ناگیرێت..هەر دەبـــــێ هونەرمەندان ئاوارەبن ..خەلکەکەشی هەژاربن..

کە من رێم نەدەن تابلۆیەک بە ئارەزووی خۆم بکێشم.. کە من چوار چێوەی تابلۆم نەبێت وە رەنگـم نەبێت..کام بیرۆکە خۆی هەل دەگرێت بۆ سالێککی تر.. کام ئازار خۆی ووشک دەکاتەوە لەکەوانووی سەد سالەدا. ..

هونەرمەندانی کەرکووک ..هەر لەدایک بوون و ئاوارەدەبن..هەر هونەرمەندێک کە گەورە بوە هـەر لەم شارو ئەو شار بووە..هیچ لانەو چوار دیوارێکی نەبووە..

من شەرم دام دەگرێت کەسێکی گەورەیی شارەکەم دەبینم دبێت لە هەولێرو سلێمانی بۆ مافـــــی کەرکووک رابکەن.من شەرم دام دەگرێت دەبێ خەلکانێک بچن بۆ لای مافدارانی شارەوانی باســـــی کەم و کوریەکان بکەن و داوای مافە وون بووەکانیان بکەن... تا 400 هونەرمەند لە کەرکـــــووک ناونووس کراوە لە ژێر ئالای دوو رێکخراوی هونەرمەندان ..کەچی شارێکی هەژارو بێ تابلـــــۆیە دوو سێ پەیکەری سەقەد و قەلایەکی دارماو..

راستە دەلێن دەبێ خەلکی کەرکووک خۆیان داوای مافەکانیان بکەن..ئەگەر ئەوان داوای مافی خۆیان نەکەن خەلکی هەولێربۆچی داکۆکیان لێ بکات.. ئاوارەیی زۆر شتی پێ دیدە کردین. لە سالـــــی حەفتاکانەوە تا هەشتاکان هونەرمەندانی کەرکووک لە ژێر تەوژمی داگیر کەری بە هاوکاری یەکتـر کاریا دەکرد.بەلام لە سالی 1991 وە بە راستی ئاوارە بوون و دابەش دابەش بوون. دەسەلاتـــــی هونەرمەندانی کەرکووک دارماوو مردووە،، تەنها بانگەوازێکیان نەکرد کە هونەرمەندانی کەرکووک بگەرێنەوە باوەشی شارەکەیان.. مالە داگیر کراوەکانیان وەر بگرنەوە..تاو توێیەک بکەن..نەخێـــر پارەو پوول و تەماحی زەوی و زار بە باج و مەدالیای پارت و لایەن هەرچی هونەردۆست هەیـــــە کردنیان بە پالەوانی گۆرەپانی هونەرمەندانی کوردستان.. ئەوانەی تەنها هونەر نازانن چی یـــە بوون بە پالەوانی هونەرمەندان..ئەوەی تەنها وێنەیەکی گرتووە لە پال هونەرمەندانەوە بوون بە هونەرمەندو یارمەتی یان رێز لێ نان ... کام رێز... ئەو رێزەی کە ئاوارە بوون.....

ســـــەرۆکی هونەرمەندان چاوەروانی مەکرەمەیە..چونکە جاری یەکەم وەریان گرد.. ئۆتۆمۆبیل بوو.. ژمارە...... ئەندامەکانیان ئەوانەی پارەیان وەرگرتووە چاوەروانی شتی ترن وا بە دواوەیە.. وەعد وەرگیراوە... ئەوەی وەری نەرگرتووە با سوێندەکە بخوات... ئاسانە ئەوی تر..

خەلک چاوەروانی داهێنان دەکەن.. ئاوەدان کردنەوە دەکەن ئەمرۆی جیهانیش ئەمرۆ لە داهێنانـــی نۆێدان.. ئەوەی لە سەرەتاوە هونەرمەندێکی داهێنەرو نوێ کار نەبووەو بەردەوام نەبووە تازە بـــەو کۆتایی ژیانە..زۆر زەحمەتە خۆی بە پالەوانی گۆرەپانەکە بزانێت.

هونەرمەندانی کەرکووک.. لە دەرەوەی وولات.. زۆرن وە کارشیان زۆرە وە بە چالاکن..بەلام بە داخەوە تا ئێستاو داهاتووش لەو بروایەدا نیم بانگەنیشین بکرێن بۆ ئاوەدان کردنەوەی کەرکووک..چونکە تا هەرزان هەبێت پێویست بە گران ناکات.. هونەرمەندانی کەرکووکیش داهێنەری چاکی هەیە وە کاری جوانیان کردووە .. بەلام پێویستیان بە گۆران کاری هەیە ئەویش لادانی کورســـــــــــی حوکم کردنە وە رێگا دانە بە داهێنەران.

کەرکووک دەبێت کاری گەورەی بۆ بکرێت لە دیوار بەندی و هونەری بگاتە ناو شارو گەرەکەکان... پێشانگای هونەرمەندانی کەرکووک درێژەیی پێ بدرێت وە کاری نۆێ پێش کەش بکەن ..

چاوێک بەو ناوانە بگێرن کە چ هونەرمەندێکن هونەر مەندی پارە یان کارو هونەر.گەلەریەک بـۆ کەرکووک دروست بکەن نەک کەلاوە رووخاوەکەی قشلە.. مرۆڤ کاتێک سەردانی کەرکووک دەکات شەرم دای دەگرێت.. لە وێرانی و کاول کاری شارەکە.. سەد سالە کەکووک کەلتوورێکی کـــــوردی دەپارێزێت بەلام پێویستە هونەرمەندان تازەگەری تیادا بکەن..

ئاوارەیی هونەرمەندانی کەرکووک گریانێکی هێواشە.. چونکە ئەوانەی نوێنەرایەتی هونـــــەری کەرکووک دەکەن دوورن لە تازەگەری هونەر...ئاوارەکان پێویستە بە بانگەوازێک بگەرێنەوە بـــۆ کەرکووک تا ئاوەدانی بکەنەوە....................

***

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە...

### هونەرمەندی شێوەکار     دارا حەمە ســـەعـــی

**ئاشتـــــی گەرمیانی**
**هۆلـــــــەنـــدا**

# غوربەتــــــــی ی ئەوروپـــــــا....تووشی غوربەتی کوردستانی کرد#
# تا ئێستا کەس دەروونی کێشەکانی هونەرمەند دارا حەمە سەعی نەخوێدۆتەوە.. بۆیە تووشی ئازاری گەورە بووە #
# پەیکەرەکـــــــــان...شاهیـدی راستەوخۆی هونەری هاوچەرخی کوردین... لە کوردستان و ئەوروپادا#

رۆژگارێک هەیە ناوی داهێنان و تازەگەری هونەرمەندی شێوەکاری کورد دارا حەمەسەعی یە.. لە عێراق و ئیتالیا و سەرانسەری ئەوروپا بە گشتی.. هەر ئەو رۆژگارەش گەراوەتەوە بۆ کۆمەلێک ئازاری جیا جیـا و سەر سوور هێنەر ئەویش هونەرمەند مامۆستا دارایە کە کوردستان بۆ ئەو هیچ ئاواتێکی تیادا نی یە.....
ئەتوانم بلێم مامۆستام دارا حەمەسەعی سالی 1983 و 1984 تازە لە رۆما پایتەختی ئیتـــــالـــیا پاش 15 سالی ژیانی گەرایەوە کوردستانی زێدی باو باپیری .. ئەو تەمەنەی لە ئیتالیادا بەرێ بـــــرد بە کارو سەرقالی هونەری پەیکەرسازی و پێشانگاو چالاکی هونەری..
هونەرمەند پاش تەواو کردنی ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدا ئەوکات حکومەت قوتابییــــــان و دەرچوانی بۆ لێکۆلینەوەو خوێندن رەوانەی دەرەوە دەکرد یان لەسەر حیسابی تایبەتی خۆیان ، زۆر لـــــە قوتابیانی عێراقی بەتایبەت کورد سەردانی ئەوروپایان دەکرد وە هەندێکیان دەمانەوە هەندێکی تریـش دەگەرانەوەکوردستان..ئەو کات پەنابەری زۆر کەم بوو.

مامۆستا دارا بۆ جاری یەکەم سالی 1984 لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان ی شاری سلێمانی وانـــــەی پەیکەر سازی بە قووتابیان دەوتەوە .. زۆر لە تەکنیکی هونەری و ریبازی جیا جیای فێری قوتابیـــــان کرد ، وە زۆر قووتابی لە ژێر دەستی ئەو پەروەردە بوو.. ئەو وانانەی بەرێزیان بوون بە ریچکەیەکی هونەری لە ناو شێوەکاری کوردیدا..بەلام بەداخەوە زۆریش بەداخەوە.. ئەو رێچکە هونەری یـــــــە خزمەت نەکرا، نە خزمەتی مامۆستا دارا کرا وە نەخزمەتی ئەو قوتابخانەیەش کە قووتابـــــــی تیادا پەروەردە دەکرد.. هەر لەو سەردەمەشدا حکومەت بەهیچ شێوەیەک پەرەی بەکەسایەتی کــــورد نەدەدرا.هونەرمەند دارا حەمە سەعی تا سالی 1991 و دواجاریش لە کوردستان چاوم بە بەرێــزی کەوت لە هەولی ئەوەدا بوو کاری هونەری بکات وە شارەکان برازێنێتەوە.. بەلام لەوە دەچێـــــــت پارتە کوردیەکانیش بەپێ ی پێویست نەیانتوانی ئەو داهێنەرە خزمەت بکەن وە بەرهەمی غوربەتی چەندین سالەیی بۆ ئاسان بکەن و ئاواتەکانی بهێننە دی..... من بێگوومانم لەوەی کە پاش بـــە دەنگ نەهاتنەوەی هونەرمەند دارا ..هونەرمەند بۆ خۆی رۆژی سەدان جار پەشیمانە لەگەرانەوەی بۆ عێراق و کوردستان.چونکە لە ئیتالیا زۆر رێزی تایبەتی لێ دەگیرا وە کار ئاسانی بۆ دەکرا لـــــە کارو چالاکی یەکانیدا ..وە هەر ئەو ئازارانە بوو کە بەسترایەوە بە کوردستان و ژیانداری وە کـــاری لە باری دەروونی و بوونی دارا حەمە سەعی کرد....

ئەو مرۆڤە خاوەن هەستێکی گەورە و دلێکی گەورەیە وە بە راستی نمونەی زۆر کەمە بەلام دەبێـــت کەسانێک هەبێت ناخی ئەو مرۆڤانە بخوێنێتەوە و لێ ی تێ بگەن.. چونکە تێگەیشتن لـــــــــە هونەرمەندیش کارامەی هونەری دەوێت..حزبایەتی یان دووبەرەکی.. رەنگ دانەوەیەک بوو کەلـــە راستیدا پارتەکان ئەو کەسانەیەیان لا مەبەست بوو کە یەکەم سەربە حزبەکە بن پاشان هونەرمەند بن ئەمە وای کرد کە ئێمە دوابکەوین لە کاروانی هونەری لەسەر هەموو ئاستەکان..

ئەگەر بگەرێینەوە بۆ شاکارەکانی دارا حەمە سەعی من لە ئیتالیاوە دەستی پێ دەکەم کە لـــە زۆر مۆزەخانەو گەلەری شارەکانی رۆماو فلۆرەنساو ڤینیسیاو میلانۆ کاری ئەم شاکارە دانراوە و رۆژانـــە چەندین میوان لە جیهاندا کارەکانی دەبینێ وە تا ئێستا دەتوانم بلێم کەم کەس جێگای ئـــــەو هونەرمەندەی گرتۆتەوە هەر لە تەکنیک و تازەگەری تا توانای بەکارهێنانی کەرەستەی برۆنـــز وەکو خۆی وە بەکاهێنانی رەنگ و دانانی ئەو رەنگانەی کە لە ریلیفدا بەکاردێت.. پاشان دەســـت نیشان

کردنی ئەو بابەتانەی کە لە فۆرمەکاندا کارەساتی مرۆڤایەتی جیهانی و بەستراوەی مـرۆڤ لە چوارچێوەیەکدا یان دیموکراسی مرۆڤ بەرادە بەدەر کە زیاد لە خۆی بەرەلای لیّ بۆتەوە ئەوەش لە کارە هونەریەکانی هونەرمەند دارا دا دەبینرێت ئەگەر مرۆڤ بە وورده کاری تەماشای کارەکانی بکات ئەوا بە راستی لە کەم گەلەری جیهاندا ئـــەو ئاستە هونەری یە دەبینیت، من دەلێم داهێنەرێکی ئاوها پێویستە هەتا لە ژیاندایە مەدالیـــــای برۆنزی بۆ بکرێت نەک پاش نەمانی.. داهێنانەکانی دارا حەمە سەعی شاهیدی ئەو هاوچەرخی یـــەیە کە لە کارەکانیدا رەچاو دەکرێت...

***

## تابلۆی بالندەو هەتــــــــاو لە هۆلەندا

### پەیامی کورد.. هۆلەندا

بەسەر پەرشتی دەزگای پەنابەرانی هۆلەندی لە شاری ئەمستردام رێکخراوی پەنابەر لە شـــاری دورینی رۆژئاوای هۆلەندا لە رۆژی 19.11.2005 بە ئامادەبوونی سەرۆکی کەلتووری شارەوانــی دورین و ئەندام و لێپرسیارانی دەزگای پەنابەران و شارەوانی تابلۆی بالندەو هەتاوی هونەرمەند ئاشتی گەرمیانی یان کردەوە بەو هاوبەشی یەی کە تابلۆکەیان تەواو کرد بە هەندێ وێنە دروست کردنی کاری مندال و دەربرینێک بۆ رۆژی هاوبەشیان لەگەل پەنابەران وە هاتنیان بۆ ئـــــەم قوتبە.

پەنابەران نەک تەنها میللەتی کورد ئامادە دەبێت بەلکو خەلکی ئەفغانســــــــتان و رۆژئاوای ئەفەریقیاو ئێران و وولاتانی تر ئامادەیی ئـــەم بۆنەیە دەبن وە کاری جـــۆراو جۆر پێش کەش دەکەن چ بە مۆسیقا یان بە پەرتووک بلاوکردنەوە یان بە کەل و پەلی فۆلکلۆری غوربەت و پەنــا بەرێتی لە چاوی ئەو مرۆڤانەدا بەرچاو دەکەوێتەوە باس لەو ئازارانە دەکەن کە لەگەل خۆیاندا هێناویانە بۆ ئەوروپا، هەربۆیە هونەرمەند ئاشتی گەرمیانی لەم چالاکی یەدا بـــەو دوو کۆترو هەتاوە دەیەوێت باس

لەو کۆچ بەرانە بکات کە تەنها قوتب ڕێگاو جێگای کردونەتەوە..هەتاوی ساردی ئاوابوونیش چاوەروانی ئەم کۆچ بەرانەیە.
دوا چالاکی هونەرمەند ئاشتی گەرمیانی ئەوە بوو کە لە مانگی مایی 2005 لە شاری دەمبـووش بە ئامادە بوونی بەرێزان ولیم الکسندەر کوری شازادەی هۆلەندا وە بەرێز بالکندەر ســــەرۆک وەزیرانی هۆلەندا ئامادەیی کردنەوەی تابلۆی هونەرمەند ئاشتی بوون بە بۆنەی ڕۆژی 5 مــاییی لە هۆلەندا ئەمـەش وای کرد کە دەنگی میللەتی کورد لەلای هەموو سەرۆکان و خەلکانی ئەوروپا بێت.
ئەمرۆش بە ئامادە بوانی شارەوانی شاری دورین بەشداری ئەو تابلۆیانەیان کرد کە نـــاوەروەک فۆرمی تابلۆکە ئازاری پەناهەندەیی لە ئەوروپا لەگ،ەل ئەوەش هونەرمەند ئاشتی گەرمیـــانی چەندین دیکۆمەندی تایبەت بە وێنەی کــوردستان پێش کەشی ئامادەبوانی کردلەو ئامــــادە بوانەش چەندین کەسی ناوداری تیادا بەرچاو دەکەوت،، هەموو سالێک ئا لەم کاتەدا تابـلۆیەکی نوێ دەبێتە میوانی شارۆچکەکانی ڕۆژئاوای هۆلەندا.. دەزگای بەنابەری هۆلەنداش لە هەمــــوو کارو چالاکی یەک داوەتی هونەرمەندی شێـــــوەکاری ئاشتی گەرمیانی دەکەن بۆ ئەنجام دانی چالاکی یە هونەری یەکانی ڕۆژی پەنا بەران.. ئـــــــەوەش بۆ خۆی دەربرینێکە لە ناساندنی ناسنامەی کورد لە ڕۆژئـــــاوای هۆلەندا و ئەوروپا وە وا بریاریشە لە داهاتوودا دوو پێشانگای تایبـــــەتی بۆ بەلەدی یەکانی ڕۆژئاوی هۆلەندا بکاتەوە بە ناوی ئازارەکان لە کوردستانەوە.

***

# وولاتێکی بێ دەنگ و ئاسەوارێکی وێران

ئاشتی گەرمیانی    هۆلەندا

....بۆ بیرەوەری ئەنفال لە گەرمیاندا....

وولات و هەردەو هەڵەت نەما نەگەرێم . هەر لە قوتبی ساردەوە تا ئەسکەندەنافیاو ئەورووپاو کۆتایی سنوور ..لێژ تر تا کەنارەکانی دەریای سپی .. دەریاچەو گەرما و دوورگە تـــــــا کوردستان و ناوچەی گەرمیان..سوولباتووی کە هەموو دونیا باسی لێوە دەکات..لەنـــــــاو بەردەلانیدا دەست وەردەدەم.. ئا لەوێدا چی بیرەوەری و مێژووی مرۆڤایەتی هەیە مـــــــرۆ دەیبینێ.. دەبینێ لەو گردە لۆکەو ئەشکەوت و پاشماوەیکە هەر مرۆڤ خۆی بەردی لەسەر بەرد داناوە. خشت لەسەر خشت .. گەرمیان ئەو بەهەشتەی کە گەرمیانی پێ دەلێن. بــــــەردی ئاسن کە دارو دەشتی تەنیوەتەوە لەهیچ وولاتێک ئەو ووردە بەردەم نەبینیوە،

ئا ئەوەتا وەردی گەرمیانی باسەرەو سوولباتوو بووە بە شایی لە دایک بوونی بەردی ئاســـن ئەم بەردانە لەوە دەچێ لە دوای نەمانی مرۆڤەوەلەم ناوچەیە گەرایان کردبێت و لەدایک بین.

نایانەوێ جارێکی تر کەسێکی تر پێیان پێدا بنێت. بێ دەنگ کپ و مات.. زەمانە گونـــــدی شایی و رەشبەلەک لاوی جوان جوان دەم بە خەندە دل ئاوێنە .. لەتە ئاوێنەو شانە و وورد ە

دۆینەو دەسترێکی رەنگاو رەنگی رەشبەلەک.. ئایی رەشەبای گەردەلوولی وویران کراو.. کـــوا رەشبەلەکی بەهارت بۆ شایی ئەنفال .. کوا پاشماوەی سەرەکانیــــــت....

مندال بووم لەسەر ئەم کێو بە کێو .. لاو بووم لەبن ئەم دارو ئەو دار ، دەنگی عەلەشیـــــش و مەکینەی ئاردەکەی گوندی قەشقە و دەنگی بار هەلگر .. کوا پاشماوەی مەکینەکەو ئاخوور ی ئاژەلەکان.. کوا خشتە تەرەکان کواو کێ بردی.. گەردەلوول لە گرمەی گەرمیانەوە هـــــەلــــی کرد .کێ ی رانەمالی .. جل و بەرگی مرۆکانی گەیاندە قەتب .. من لەسەر کەنارەکانــــــــی دەریایی باکوور چەند پارچە جلێکی تەرم بینی .. بەرەنگ و بۆن ..رەنگەکان کال بونەتـــەوە لای من لە وولاتی سارد رەنگی ئەو جل و بەرگانە کال بونەتەوە لە چاوانمدا.

من رۆیشتم چاوێک بە بەردو کانی تەمەن بگێرم .. یەک یەک هەلی بدەمەوە ..کاکە مـــــن سەدەیەکە نەهاتووم چاو لەم خاک و خۆلە بگرم .. ئا ئاخ ئەی زەمەنی دەست بەشیــــــــر چۆن دلت هات لەرەگەوە لە گەرمیانەوە بمانبریتەوە .. ئاخر چۆن دە پێم بلـــــــــــێ ئیستاش تابلۆکانم هەر بۆنی تۆی لێ دێت .. دە توخوا لە قەفەسی قوتب بەرەلام بکـــە ن با بێم بەرد بەرد .. گرد بە گرد گاولکی ی بکەم .. ئـــاخ بۆمباو ئاسن و هاوەن چیـــــت بە خەونەکانمان کرد و چۆن خاپوورت کرد .. وولاتێکی بێ رەنگ و پاشماوەی چەندەهـــا جل و بەرگی بێ کەللە و ئاسەوارێکی ووێران.

..........................................

## تیشکێک بۆ کارو چالاکی هونەرمەندانی کورد

هونەرمەند غازی محمد

**ساسان وە ئاشتی......؟؟؟؟؟**

! دوای بۆردومانی قەلادزێ و کارەساتی 1974 و شەرەکانی تری عێراق هونەری شێوەکاری کورد غازی محمد درێژەی بە هونەرەکەی دا.....

! گەرمــــیان.....هەوێنی کارەکان و خەم رەوێنی مرۆڤی گەرمیانن..

! رەنگی گەرمی گەرمیان و هۆرەکەی..جەوەل بۆر، نزیک ترین وێستگەی ناوەرووەکی تابلۆکانی هونەرمەند غـــازی محمد' ه.................بۆیەمە لەسەرو کەواو سەلتە کەلتووری ناوچەکەو هەوێنی ئەو تابلۆیانەیە کە چل سالە لە کاسە سەری هونەرمەندا دەخولێتەوە...

یەکێک لەو هونەرمەندانەی لە کوردستانی عێراق کە زۆر باسی لێوە دەکرێت و خاوەن چالاکیەکی بەرچاوە لە سەرانسەری کوردستاندا ..هاورێ ی چەندین هونەرمەندی ناسراوی کوردەو ئەمرۆ کۆچیان کردووە لە کوردستاندا ئەویش هونەرمەند غازی محمد

ه كه له دایک بووی شاری کەرکووکە و هەر لەو شارەدا گەورە بووە و قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی تیادا تەواو کردووە . پاشان کولیژی ئابووری له زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە سالی1977.

چالاکی هونەرمەند هەر لە چالاکی قوتابخانەکانی کەرکووکەوە تا ناوەندی و ئامادەیی و زانکۆ و پاشان بۆ شارەکانی کوردستان گوازرایەوە وەک کەرکووک هەولێر دهۆک و سلێمانی و ناوچەکانی گەرمیان و هەروەها لە بەغداو بەسرەو رومادی و شارەکانی تر..

هەنگاوێکی تر ئەویش تاقی کردنەوەی له سووریا بەتایبەت دیمەشق و حەلەب.........

بەشداری لەگەل هونەرمەندانی کەرکووک و ئا مادەیی لە نێو هونەرمەندانداا خۆی بۆ خۆی بەردەوامیەکە لە دروست کردنی لاپەرە هونەریەکانی هونەری شێوەکاری کوردی لە کاروانی ئەمرۆدا .تایبەت مەندێتی هونەرمەند لەوەدایە کە هەموو ئەو دەم و چاوانەی وێنـــــەی کێشاوە دەم و چاوێکی گەرمیانین وە جل و بەرگێکی گەرمیانین ، لەلایەکی ترەوە زینـــدوو کردنەوەی کەلتووری گەرمیان لە چوارچێوەی تابلۆکانی هونەرمەند غازی محمد ئەوەش بـۆ خۆی تایبەتمەندیەکی تری ئەو هونەرمەندەیە.

تێروانینی هونەری هاوچەرخ ئاوهایە کە پاراستنی کەلتوورو کەلەپووری کوردی لە رێگـای هونەرو کەڤالەوە ساغی و رەسەنایەتی ئەو میللەتە دەنوینێ بە تایبەت ئەگەر ئەمـــــرۆ تەماشای ئەرشیفەکانی دونیا بکەیت هەر لە مۆزەخانەکانیانەوە تا گەلەریەکانیـــــــان کۆلەکەی کەلتووریانە مێژووی لە دایک بونیانە... هونەرمەند غازی محمدیش ویستوویەتی وە هەولی بۆ ئەو راستی یە داوە لەرێگای رەنگ کردنی تابلۆکانیەوە کە ئەو مێژووە پـــــر کارەساتە بپارێزێت لە چوارچێوەی تابلۆکانیدا........

سەمفونیای تابلۆکان لە کوێ وە سەریان دەرکردووە .. ئەو ئاوازە چی یە رامان دەکێشێـــت بۆ ناو ئازەرەکانی وە چ هۆرەیەکە ناسکی دەنگی لە باسەرەوە دەمبیاتەوە بۆ رۆخـــــانەو تاوێک مرۆڤ بیری مێژووی ئەو ناوچەیە دەکاتەوە کە تا چاو بر بکات هەر کوردستانـــەو رەشمالی هەلداوە ئاو هەواکەشی گەرمایی دەشتی گەرمیانەو حەمرینی بە خۆیـــــــەوە بەستۆتەوە..ئەو هەست و بیر کردنەوەیەیە کە هونەرمەند غازی محمد توانیوێتـــــــی لە کەڤالەکانیدا دەربرینی لێوە بکات وە دایان برێژێت بە شێوەیەکی هونەریانە.......

بۆیە تا بلوێری شوانی گەرمیان و پاشماوەی ئەنفال و وورە وورى ئاوى باسەرە دەنگی بێت ئازەرەکانی هونەرمەند نەک لە تابلۆدا بەلکو لە نەخشەی کوردستانیشدا جێگایان نابێتەوە...

غازی محمد ئەمین

-1954 لە کەرکووک لە دایک بووە

-1977 بەکالۆریۆس لە ئابووریدا زانکۆی سلێمانی

-1973-1977 چالاکی هونەریەکانی زانکۆی سایمانی

1978-1979 پێشانگای هاوبەشی دیالە

-1989 هاوبەشی لەگەل هونەرمەندان فەلاح ئۆمەرو عەدنان شینۆ لە هەولێر

-1993 هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندان ئاشتی گەرمیانی و فەلاح ئۆمەر لە سووریا

-1994 هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی کەرکووک لە سلێمانی

-1996 ڤیستڤالی هونەری کەرکووک لە شارۆچکەی چەمچەمال

-1997 هاوبەشی پێشانگای هونەرمەندانی سلێمانی

-1998 هاوبەشی پێشانگای ئەنفال لە سلێمانی

-1999پێشانگای تایبەتی یادی بۆردوومانی شاری قەلادزێ لە قەلادزێ

-2000 تا ئێستا بەردەوامە لە چالاکی هونەری

***

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

هونەرمەندی شێوەکار  ئیســـماعیل خـــەیـــات

**ئاشــتی گەرمیانی..هۆلەندا**

ـ تەمەن دەروات و تابلۆکانیش دەبنە چرای رۆژگار..
ـ سەدەیەک لە کار کردن.. یەشتان خۆشەویستی هونەر کۆتایی نەهاتووە..
ـ بالندەکان کۆچیان کرد. دەم و چاویان بوون بە فۆرمێکی تابلۆکانی ئیسماعیل خەیات..

کەم قوتابی هەیە بە وانەکانی مامۆستایی هونەرمەندی کورد ئیسماعیل خەیاتدا تێ پەر نەبووبێت و خۆیان بە قووتابی ئەو نەزانن لەگەل ئەوەی کە ئەمرۆ مامۆستان یان وەزیرن یان دکتۆرن یان بازرگان و کریکار.. زۆری تر پێشمەرگەی چیاو خەونە ساردەکان بوون     و هەر لەسەر ئەو چیایەش شەهید بوون.. هەندێکی تریش لە گەرمیانەوە بەرەو بیابانەکان کۆچیان کردوو نەگەرانەوە ..لەهەر قوتابخانەیەک و گەلەری یەک ،کۆمەلێک بیـــرەوەری و یادگاری رۆژگار بە جێ ماوە.
داهێنانەکانی بەرێز خەیات وای لە کوردستان کرد کە سەرچاوەیەک دروست بکات بــــە ناونیشانی هاوچەرخێتی هونەرو گۆران کاریەکانی هونەری شێوەکاری کوردی..ئەگەر مرۆڤ چاوێک بە لاپەرەکانی ئەو مرۆڤەدا بگێرێت لە راستیدا زۆر وەرچەرخاندن و تازەگــــەری و گۆران کاری ئە هونەرمەندە دەبینیت.. هەر لە رێبازی ئەکادیمی و ریالیستی یەوە تـــــا دەربرین خوازی و هێلکاری ناوچاوگەکان و وورد بوونەوە لە هێما خوازی و سوریالیزم تـــا ئەمرۆی تەجریدیەت وهەلشاخان بەرەو فۆرمە جیاجیاکان و هاودەمی ئەمرۆی نوێ خـــوازی جیهان، خەیات مرۆڤێکی ماندووە زۆریش ماندووی رێگایەکی پـــر لە هونەر و قوول بونەوە بەرەو ناخی ئەو هونەرە شێوەکاریەیی کە هەرچی سنورێک هەیە یەک لای کردۆتەوە.. زۆر دەم و چاوی جیاجیا زۆر بالندەی سەیر سەیر..ئەو کلاوبەرۆژانەی کە چیایین ئەو مرۆڤانەی کە بەندی دەشتی گەرمەسێرن.. هەزارەها نمونەی ئاوت لاینی و سکێچ و فۆرمی تایبەتـــی

له مێشکیدا دێت و دەروات .. پێشانگاکانی خەیات لە بەغداو سلێمانی و کەرکووک و هەولێر تا دهۆک و بەرەو پاریس و ئەمەریکاو یابان و کۆریا...هتد. دروست کردنی رۆژگـــــــاری هونەرمەند ئیسماعیل خەیاتن. ئامادە بوونی هونەرمەند لەو رۆژانەی کە تۆپ و تەیـــارەو ئاسن حوکمرانی وولاتێکی دەکرد.من تەنها ئەوەندە دەتوانم دەربارەی ئەم هونەرمەنـــــدە بدوێم کەوا سەر دێرەکان باسیان لێوە بکەم.. ئەگینا هونەرمەند خەیات زۆر گەورەترە لـــەم باسە کورتە.

بەلام ئەوەی سەرەنجی من و هونەرمەندان و رۆشەنبیران رادەکێشێ ئەو قوتابخانە تایبەتەیە کە هونەرمەند خەیات دایمەزراندوە وە دروست بووە بەو رێبازەی کە کارەکانی لە هیچ کارێکی تر ناکەن وە زۆر سەرکەوتوانە کاری بۆ کردووە ، کاکەی خەیات زۆر تابلۆی بۆ بەرگی پەرتوک وە گۆڤار و پۆرترێتی کەسایەتی کێشاوە.. هونەرەکەی جێگای سەرەنجی کەسایەتی کوردی  و ئەورووپیشە وە بناغەیەکی گەورەیی بۆ هونەری شێوەکاری کوردی دامەزراندوە.. بێگومان بـــــە تاقی کردنەوەو سەلماندنەکانی هونەرمەند زۆر رێگای هونەری کوردی کوورت کردۆتەوە.

دوا هەنگاوی هونەرمەند ئەو سەردانە بوو دوا گەرانەوەی لە وولاتە یەککرتوەکانی ئەمەریکـــا بۆ فەرەنسا لە شاری باریس و لیل کە بە کۆمەلێک هونەری جوانی خەیاتی پێش کەش کـــــرد خاوەن چەندین مەدالیاو رێزلێنانی هونەری گەورەیە سەردەمانێک هونەرمەند خەیات لــــــــە هەولێر بەریوبەری هونەری شێوەکاری سەربە وەزارەتی رۆشنبیری بوو سالی 1992 .

هونەرمەند خەیات ئەوەندە چر بۆتەوە بە شا دەمارەکانی هونەردا دەبێت زۆر بە ووردی کارەکان شی بکەیتەوەو لە دەم چاوە تایبەتەکان وورد بیتەوە ئەگینا ئەو جیهانە گەورەیە زۆر بـــــــە ئاسانی بە سەر مرۆڤدا تێ دەپەرێت و مرۆڤ هیچ بەرجەستەیەکی بۆ ناکات، ئەو هێلانـــەی هونەرمەند دەیکێشێ لەو دەرونەوە هەل دەقوولێ کە زۆر جار پاشماوەی شەرو وێرانکـــــاری ئەو رۆژگارانە بوون کە مرۆڤی کورد رووی لە وون بوون دەکرد.. وە گوندی کورد خابوور دەکران پاشماوەی خەلووزی ئەو سووتاوی یە ئاکامی ئەو تابلۆیانەن کە هونەرمەند بە چاوێکـــــــی ووردە کاریەوە کێشاویەتی.. بۆیە رەش و سپی تابلۆکانی هونەرمەندی کورد ئیسماعیل خەیات هیچ کات لەیاد و بێ چاو ناکرێت..

ئیسماعیل خەیات بوونی و تابلۆکانی دەبنە چرایەکی درەوشاوە لە رۆژگاری ئەمـــــــرۆدا..

باڵندەکانیش تاک تاک لە چوار چێوەی تابلۆکانیدا باڵ دەگرن و دێن و دەرۆن .. دەیانەوێ هونەرەکەی ئیسماعیل خەیات بگەیەننە ئەودیوی چیاکان.

***

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

### هونەرمەندی شێوەکار ئەکرەم عـــــەلـــی

**ئاشتی گەرمیانی...هۆڵەندا**

......پاش چاوەروانیەکی زۆر...رەنگەکان.. گەیشتنە ئەو سەری قوتب...

......رێبازی ئەکادیمی هۆیەکە بۆ دەربرینی تابلۆکان...................

......رێز لێ گرتنی هونەرمەندان لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان ئەرکی حکومەتی هەرێمـــــی کوردستانە بە بێ جیاوازی........

هونەرمەندی شێوەکار ئەکرەم عەلی یەکێکە لەو هونەرمەندانەی کە سەرەرای سـەختی و دژواری رۆژگارێکی زەحمەتی بری.. درێژەو بەردەوامی داوە بەکارە هونەریەکانی، زۆر هونەرمەند پاش گوزەرکردنیان لــــە کوردستان و نیشتەجێ بوونیان لە ئەوروپا یان لە کیشوەرێکی تر ئیدی بە داخەوە ژیانی نوێ وایـان لـێ دەکات کە سەر قاڵی ئەو کەلتوورە نوێ یە بن و دوور دەکەونەوە لە هونەرو دونیای هونەر..

ئەو هونەرمەندەش خاوەن زۆر چالاکی و کاری جوانە، هونەرمەند ئەکرەم عەلی توانیوێتی ئەو لایەنــــە بەرجەستە بکات کەزاڵ بێت بەسەریدا و درێژە بە کاروانە هونەری یەکەی بدات.

ساڵی 1996 دوا دیدارم لەگەڵ هونەرمەند بوو کە پێشانگای کۆمەڵێک لە دەرچوانی پەیمانگای هونــەرە جوانەکان بوو لە شاری سلێمانی.. کۆمەڵێک لە تابلۆی گەورەو جیاجیا.. چەندین تاقی کردنەوەی وورد و جوانی تیادا بوو ..هونەرمەند ئەکرەمیش بەچەند تابلۆیەک بەشداری کردبوو.. بەداخەوە زەحمەتـــــی ژیان و رامیاری وولات

وای کرد کەهەریەکەیەک لە دوورگەو ناوچەیەک بگیرسێتەوە.. پاش بەسەر چوونـــی 15سال و 25 سال بە دوا گەران..جارێکی تر شاد بوینەوە بە هونەرەکەی ئەو هونەرمەندە کە ئێستا لــە قوتبی ستۆکهۆلم نیشتەجێ بووە و بەردەوامە لە چالاکی هونەری شێوەکاری.

دیارە لەم کارانەی دوایی هونەرمەندا زۆر شێوەی ئەکادیمی و توێژینەوەیی لامەبەستە وە هەندێ جاریش رووکردن لە سروشت و رەنگ.. ئەو رەنگانەی کە تازەن لە چاوانی ئێمەدا.. ئەو تەم و مژو جوانـــــــی هەتاوەی کە وەکو هێلکەیەکی زەرد وایە یان ئەو هەتاوەی کە ناوی هەتاوە لە قوتب شێوەیەکـــــــی زەرد و بێ تین و گەرما.

ئەو دەریایەی کە کۆتایی نییەو ناوی دەریای باکورە یان دەریای بەلتیق.جوانی ئەو سروشتانە کـــــە تازەن لە چاوانی ئێمەدا وای کردووە پتر کاری بۆ بکەین و خۆمان لەو رەنگانەدا کۆبکەیـــــــنـــەوە.

کوردســـتان و ســـروشتی کوردستان.. لەبەر سووتاوی و هەر جارەی بەمانایەک وێران دەکــــــران وە هەشت سالی شەر و کاول کاری.. وای کردبوو کە هونەرمەندیش بیرو هۆشـــی بروات بۆ ئـــــــەو بابەتانەی کە بۆنی شەرو کاول کاریان لێ دەهات... هونەرمەند ئەکرەم ئەو هەموو فۆرم و بابەتانـەی کێشاوە کە باسمان کرد.. وە ئەزموونێکی جوان و پاکی هەیە لە دونیای هونەری شێوەکاری کوردیـــــدا وە لە زۆر پێشانگاو چالاکی هونەریدا ئامادە بووە.. ئەمرۆش وا ئەندامێکی چالاکە لەو بلاوکـــــراوە هونەری یە ئەلەکترۆنیەدا www.chrakan.com وە دەستەیەکی جوانیان پێک هێناوە ئەو لاپەرە هونەری یە وێستگەیەکی تری هونەرمەندانی کوردە کە بتوانن لەوێدا هونەرو چالاکی خۆیـــانـــــی تیادا پیشان بدەن..

ئەو رێبازەی هونەرمەند ئەکرەم عەلی هەر وەک باسم کرد ئەکادیمی و توێژەرەوەیە وە زۆر جــــــــار دەربرین خوازی یە.. ئەمەش وای کردووە کە زۆر جاریش بگەرێتەوە بۆ کاری ستیلایف و مۆدێل و بـــروا کردن بە تاقی کردنەوەی رەنگ.هەندێ جار مرۆڤ دونیای رەنـــــگ دەکێشێ تەنها بۆ مـــــــــرۆڤ و مرۆڤایەتی هونەرە.. هونەرمەنیش ئەو دونیا هونەری یەی نەخشاندوە لە رەنگ کە تەنها بۆنـــــــــی مرڤایەتی لێ دێت و باسی ئازارەکانی کوردستان دەکات.. هەر جاریش ئەوەم ووتووە هونەرمەنـــــــدی کورد خۆی پەیام و ناسنامەی میللەتی کوردە لە ئەوروپا.چونکە لە هەموو پێشانگایەکدا هەر ئـــــــەو دەربرین لەو گەل و کۆمەلە دەکات.

بۆیە بۆچوونی من ریزلێ نان لە هونەرمەند بەتایبەت لە ژێر ئالای کوردستاندا دەبێت پارێزراو بێت و پتر کارو خزمەتیان بۆ بکرێت چ ئەو هونەرمەندانەی کە لە دەرەوەی کوردستانن وە چ ئەوانەی کـــــە ئێستاش لەناو کوردستانن وە بێ بەشن لە ئەندامێتی ریز لێ نان....

بۆیە نمونەی هونەرمەند ئەکرەم عەلی و چەندانی تر سووتانی ئەو رۆژگارەن کە هونەرێکی رەسەنـــی کوردی دێتە کایەوە.

هونەرمەند ئـــــــەکرەم عەلی

ـ 1963 لە شاری سایمانی لە دایک بووە.

ـ 1986 پەیمانگای هونەرەجوانەکانی شاری سلێمانی تەواو کردووە.

ـ 1996 یەکەم پێشانگای تایبەتی لە هۆلی کرێکارانی سلێمانی کردۆتەوە.

ـ1986 بەشداری پێشانگای کۆمەلێک لە دەرچوانی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە شاری سلێمانی کرددوە.

ـ1986 بەشداری رۆژی هونەری لە سلێمانی کردووە.

ـ1984 تا1992 بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کوردی لە کوردستان کردووە.

ـ1991 بەشداری پێشانگای گەرۆکی هونەرمەندانی کوردی لە ئەلمانیا و وولاتەکانی تری ئەوروپا کرددوە.

ـ1997 بەشداری پێشانگای لەگەل 5 هونەرمەندی کاری هونەری لە قەلای هەولێر کردووە.

ـ1997 بەشداری رۆژی هونەری لە شاری سلێمانی کردووە.

ـ1996 دووەم پێشانگای تایبەتی لە سوێد کردۆتەوە.

ـ1997 سێ یەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە وولاتی سوێد کردۆتەوە.

ـ2003 بەشداری پێشانگای لەگەل 5 هونەرمەند لەهۆلەندا کرددوە.

ـ2004 بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کورد لە نەرویژ کردووەلە رۆژی UN کردووە.

ـ2004 بەشداری پێشانگای هونەرمەندانی کوردی لە کەنەدا کردووە.

ـئەندامی هونەرمەندانی عێراقی یە.

ـ ئەندامی هونەرمەندانی کوردستانە.

ـ ئەندامی کارگێری دەستەی بەڕیوەبردنی بلاوکراوەی ئەلەکترۆنی www.chrakan.com

***

## له ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە....

### ڕێـــز لێ گرتنـــی هونەرمەندان

**ئـــاشتی گەرمیانی**
**هۆلەنـــــــدا**

پاش مردن و کۆچ کردن.....کـــام ڕێز لێ گرتـــــن.......

ـ له نەمانی هونەرمەندانی کوردستاندا..تەنها کاره هونەری یەکانیان.. بروا نامەی ڕێز لێ نانیانە.

له کوردستانی عێراق.. ڕێز لەو مرۆڤانەی که ئارەزووی هونەریان هەیه ، وه بەگوێ خستنی ئـــــەو هونەرمەندانەی که هەموو تەمەنیان بۆ هونەر تەرخان کردووه...ئەوه سەر دێری ئەو نارەزایی یه کـــــه چەندین هونەرمەندو ڕۆشەنبیر و دۆستانی هونەر دەستیان بۆ بەرز کردۆتەوه، وه له دەرەوەی وولاتیـــش تاو توێ دەکرێت و به یاسایەکی نارێک و دژ به بەرژەوەندی هونەرمەندو ناوی هونەرمەند له دەزگاکانـی کوردستاندا مامەلەی پێ دەکرێت..بۆ نموونه.. دوا چاوپێ کەوتنی هونەرمەندی شانۆیی و تەلەفزیونـی حاجی مەکی عەبدوالله له کەنالی زاگرۆس.. بەراستی مرۆڤ هەستی بەشەرمەزاری دەکرد کـــــــــه هونەرمەندێکی وا بەرز و ناسراو تا ئێستا نه له یەکێتی هونەرمەندان وەنه له کۆمەلەی هونەرمەنـدانی کوردستان مافی ڕێز لێنانیان پێ نەداوه وه مافەکانی نه پارێزراوه.. بەلام کەسانێک مافیان پارێـــزراوه وه بوون بەئەندام تەنها له پاشی پاشەوه له کۆرال و کۆرس له گۆرانی هەره لەیلێ ی هونەرمەنـــــدی ناسراو و کۆچ کردوو مامۆستا شەمال سائیب کۆرالی

ووتوەتەوە..یان تەنها خۆش نوسێک بووە لـــــــە بازاری لافیتە دروست کردندا..مافیان پارێزراوەو 35 سال خزمەتیان بۆ نوسراوە..
یان ئەو هونەرمەندانەی کەهەموو تەمەنیان بۆ هونەر تەرخان کردوو کۆچیان کرد.. دوا کەژاوەی کـــۆچ کردووی دەنگ بێژ خانم مەرزی یە فەریقی و مامۆستا وەلیم هەنا و مامۆستا ئازاد شەوقی و هونەرمەنـد سەروەت ئەنوەرو.....هتد. بەداخەوە تا لە ژیاندا بوون..کام فیستڤالی ریز لێ گرتن بۆ ئەم کارامانـــە وەکام مەدالیای پیرۆزیان .. وەکام تابلۆی رەنگیین بۆ تەنها ریز لێ نانی ژیانیان.. ئەمە ئەرکی ئـــەو دەزگایانەیە کە لە وەزارەتی رۆشنبیری ین لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.. ئەو رێکخراوانەی کـــــــە باس لە مافی هونەرمەندانی کوردستان دەکات ..تەنها ئاگای لە گیرفانی خۆیانە... لە راستیدا تەنــها بە یەک دێریش ناوی ئەم هونەرمەندانە لە یاداشتی رێکخراوەکانیاندا تۆمار نەکراوە......................
پاش مردن و نەمانی هونەرمەندان کام ریز لێ گرتن.. ئەی بۆچی تالە ژیاندا بێت مەدالیایەکـــــــــی درێژە بە خەبات دانی پێ رەوا نابینرێ..
کەس لەو باوەرەدا نی یە کە هەندێ ئاواز دووبارە بێتەوە وە هەندێ دەنگ بزرنگێتەوە وە چـــــــــەند تابلۆیەک دووبارەبێتەوە تایبەتمەندێتی ئەو هونەرمەندە کۆچ کردوانە لە شانۆگەری یە کوردیەکانـــدا دووبارە بێتەوە.دەنگ و ئاوازی ئەو پەپوولەیەیی کە هەردەم لە ئاسمانی پاکی کوردایەتیدا هەل دەفرێ جارێکی تر دووبارە بێتەوە بۆ کاروانی هونەری کوردی.
من پێم وایە زۆر پێویستە سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستان رێزدار کاک نێچیروان بارزانی بە تایبەت مەندێتی تەماشای ئەو بریارانەی رێکخراوە هونەری یەکان وە ئەو بریارانەی کە بە برادەری جێ بەجێ دەکرێت.. چاووی پیـــادا بێنێتەوە وە کەسانێکیش دەست نیشان بکات کە خاوەن تاقی کردنەوەو پسپۆر بن لەو بوارەدا وەرێــــــز لێ نانی هونەرمەندانی کورد سومبلێک بێت نەک ئیمزایەک بێت.لەلایەن ئەو دەزگایانەوە.. وەئـــــەو هونەرمەندانەی کە لە دەرەوەی وولاتن پێویستە وە کاتی ئەوە هاتووە یارمەتیان بدەن بۆ ئەوەی وولات کوردستان ئاوەدان بکەنەوە بە پسپۆریان بە تاقی کردنەوەیان بە داوەت کردنیان بە نامە ناردن بـــە شوێنیان نەک بە گوێ پێ نەدانیان وە فەرامۆش کردنیان..هەر فەرامۆش کردنێک زەرەروو زیانێکـــــــــی گەورەیی هەیە بە کوردستان بە فەرهەنگی کوردی.

ئەگەر هونەرمەندانی کوردستان مافی ریز لێ نانیان بۆ دا نەنێن لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان ئـەوا بێگومان بە ئەوانیش دەلێن پێویست ناکات ریزمان لێ بگرن......................................؟

❊❊❊

## فلیمی پەرینەوە لە غوبار..پەرینەوە بوو بۆ جیهان..

### کارێکی هونەری وەزارەتی رۆشنبیری و سەتەلایتی کوردستان تی ڤی...

**ئاشتی گەرمیانی**

لـە ڤیستڤالی فلیمی سینەمایی2006 لە قاهیرە ی وولاتی میسر ..کورتـــــە فلیمی کوردی کوردستانی عێراق بە ناوی پەرینەوە لە غوبار لە کۆتــــــایی مانگی نۆڤەمبەر وە لــــــە 6ی دیسەمبەری2006 وە2006/12/30 پشان دەدرێـــــت..دەرهێنەری فلیمەکە هونەرمەند شەوکەت ئەمین کوردی وە هونەرمەند نێچیرڤــــان ئەرگووشی سەرپەرشتیاری ئەو کارە فلیمە بوو کە پەرینەوە لە غوبار بوو بە پەرینەوە بۆ جیهان. دەمێک بوو میللەتی کورد خەوی بەوە دەبینی کە ئــــــازارەکانی میللەتی کورد بگاتە هەموو مالێک لە دونیادا..تەنها کورد بە پشمەرگەو ئەفسانەی ئازایەتی نەنـــــاسرێت بەلکـــو داهێنانەکانی لە سینەماو شانۆ و شێوەکاری و هونەرەکانی تـــــردا دەدۆزرێتەوە..لاوانێک هەن لە کوردستاندا خاوەن داهێنــــــانن وە ئەمرۆ ئەو هونەرەیان زۆر بە ئاسانی دەگاتە هەموو جیهان، بۆچوون لەلای ئامادە بوان ئــــــەوە بوو کە بەراستی دەربرین بــــوو لە مرۆڤایەتی و دونیایی کارەساتی شەر لە ناوچەکەدا وە کۆتــــــــــــایی هاتە بە رژێمێک کە ناوی دیکتاتـــــۆریەتی سەردەمە.هەروەک لە کوردستان تیــڤی باسی لێوە کرا .هەندێک کەس لایان وا بــــوو کە کورد بۆی نــــــی یە باس لە هیچ شتێک بکات تەنـــانەت زمانی خۆی ئەمسالی عزەت ئەبوعۆف کە پێی ی ناخــــۆش بووە فلیمێکی کوردی لە نـــاو لیستی پیشان دانی هونەری نێودەولەتی قاهیرەدایە.........وە ئــــــەو راو بۆچونە

شۆڤینـــــیانە تا کاتێکی دوور هـــــەر دمێنێت چونکە باوەریان نەدەکـــرد ئاوها بە ئاسانی رژێمێکی عەرەبی شۆڤـــــــــــــینی بن گۆر دەبێت..
لای ئەو مرۆڤانە یەشتان یەکێتی عەرەبی هەر ماوە وە هەر خۆیان سەیـــــــــدی ئەو هونەرە دەبن...بەلام بە خەباتی میللەتی کورد ئەمرۆی ئەم هونەرە ئەم داهێنانەی خستەوە کە کەســـــانێکیش لەناو هۆلی پیشان دانی ئەو کورتە فلیمەدا داهاتـــــــوویەکی چاک بەدی دەکەن لە داهاتووی فلیمی کوردیدا...بەلام هەروەک هونەرمەندان لە شاری هەولێـــری پایتەخت باسیان لێوە کرد دەبێت سینەمایی کوردی بودجەو هاوکاری یـــەکی زۆری دەوـــێت بۆ سەرخستنی ناوی سینەمای کوردی دوور لە خزمایــــــەتی کورسی..پەرینەوە لە غوبار ئەو باسەیە کە هەر کورد لێبــــووردن ودپی گەورەیی هەیە بۆ پاراستنی مرۆڤایەتی لە ناوچەکەدا..کورد بەو هـــــــــــەموو زەحمەتی و خەباتە خوێناوی وە هەر ئەو باس لە ئازاری گەلەکەی و مرۆڤایەتی دەکات..... من ئەو کارە بە کـــــــــارێکی پیرۆزی دەدەمە قەلەم وە دەست خۆشیان لێ دەکەم بەو هیوایەم کە کـــــــاری گەورە تر لە کوردستانی ئازادا ئەنجام بدرێت...با کەسانی وەکو ئەبو عۆفـــــــــــیش هەر لە سێبەری وەحدەی عەرەبیدا نوێنەرایەتی خۆیان بکەن..

***

## لە ئەرشیفی هونەرمەندانی کوردستانەوە

### هونەرمەندی شێوەکار  فایەق نوری

**ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی.. هۆلەندا**
a.chegani@home.nl

..ئەو چیایەیەی کە ناوی ڤالسە ..هەموو ئێواران لە تابلۆکانی هونەرمەندا ئاوا دەبێت..
.. چل و دوو سال.. تاقی کردنەوەی شێوەکاری کوردی..

یەکێک لە کەشکۆلی هونەری شێوەکاری کوردی.. ئـــەو هونەرمەندەی کە چل و دوو ساڵە پەنابەری شێوەکاری کوردی یە.. هەموو تابلۆکانی شایەتی ئەو حـــاڵەن کە نەک تەنها خۆی وەکو هونەرمەند بەڵکو کارەکانیشی ئاوارەیی غوربەتی فۆرمەکانیان بـــوون مامۆستایی شێوەکار فایق نـــوری سەعید ئەو مرۆڤەیە کە تەمەنێکی تاقی کردنەوەو خـــەونی شێوەکاری کوردی لــــــە ئەمرۆی غوربەتدا دەخوێنێتەوە.. بۆ ئەو لاوانەی کە رۆژێک لە رۆژان ناتوانن وێنەو سیـــــمای رۆژانی ئازارو مەینەتی بهێنێتەوە بەر چاوی خویان لەم دیدارو ئامادە کردنەدا تەنها هەندێ ئازاری رۆژانی رابردوو لە دەم و چاووی ئەو مرۆڤەماندوەدا دەخوێنمەوە ، نەک تەنها لە خودی خۆیدا بەڵکو تابلۆکانیش دەربرین لەو ئازارە بێ کۆتایانە دەکەن .

مامۆستا فایەق زۆر قوتابی پێ گەیاندوە کە ئەمرۆ زۆریان یان هونەرمەندن یان دکتۆرن یان خاوەن پلەو پایەی بەرزن لە کۆمەڵگای کوردەواریدا.

زۆر هاورێ ی جیا جیای هەبووە لە رۆژگاری ئاسن و تەلی درکاویدا.. ساڵی 1968 وە1969 کاتـــێک مامۆستا ئەندام بوو لە دەستـــــەی دامەزراندنی کۆمـــەڵی هونەرو وێژەی کوردی وە رۆڵێکی گرنگی هەبووە بۆ دانانی بەردی بناغەی ئەو قوتابخانەیەیی کە وانەو ووشەی کوردی تیادا پەروەردە دەکرێت لەگەڵ مامۆستایان شێرکۆ بێکەس ونوسەر مەحموود زێوەر و رەووف یەحیاو جیهان ئۆمەر.

بە راستی بە تێروانینی من ئەم هونەرمەندانە پێشەوای هونەری شێوەکاری کوردین وە مـــن پێم وایە دەبێت دەزگای رۆشنبیری ئەم هونەرمەندانە خەڵات بکات چونکە هەر ئـــــەوان ئەمرۆی قوتابخانەی هونەری کوردیان لەسەر تەختە پشتی بۆ ئەمرۆ گواستۆتەوە..

لە تابلۆیەکی تری مامۆستادا.... باس لەو زەمەن و کاتە دەکات کە مرۆڤی کورد باوەری بە شـۆرش و خۆپیشاندان هەبووە بە مانایی گەرانەوە بۆ ساڵانی چلەکان کە لە تابلۆیەکدا دەڵێت داری ئازادی بــە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ .....سەربەخۆی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ.

ئەو کات هونەرمەندان لەو بابەت شێوازە گەراوون بۆیە زۆربەی کارە هونەری یەکان ئەو دەربرینانەیان داچەسپاندوە.مامۆستا فایەق کەسێک بووە لە رۆژگاری ژیانیدا سەرقاڵی هونەرو وانەو قووتـــــابی و رۆژگاری تەلبەندی ئاسن و دەم چاوە چرچ و لۆچەکان کە هەر هەموویان بوون بـــــــــــە تابلۆ و هەندێک ئازاری بێ کۆتاییان دروست کرد.. تابلۆی ماتەمینی دەم و چاوەکان دەربرین لەو ئێشـــــانە دەکات کە

رۆژگارێک ببوون بە ناوەرووەکی ئەو تابلۆیانەی کە مامۆستا فایەق سە رقالی بـــوون دەربرین لە تاقی کردنەوەکانی هونەرمەند دەکات..

گەورەیی مامۆستا فایەق نوری لەوەدا بوو کە پرسیاری ئەوەی کرد چ تێروانیین و بۆچونێکی من هەیە لەسەر کارە هونەری یەکانی.. تێروانیتی من دوو بابەتە.. یەکەم. مامۆستـــــا فایق نوری ئەرشیفی هونەری شێوەکاری کوردیی یە بە مێژوو و بە تاقی کردنەوە.. دووەم ســـەرەرای سەختی ژیان و تەمەن هونەرمەند بەردەوامە لەسەر کاری هونەری ئەمەش خۆی لە خۆیدا هاوچەرخێتی ئەو هونەرمەنـــدەیە.

رۆژانە ئێواران چیایی vaals خەونێکی ئەرخەوانی بە رەنگە بۆ هونەرمەند..چوارچێوەی ژیانێکی نوێ پە بۆ بەردەوام بوون یان درێژە پێ دانە بەکاری هونەری.

ئەو مرۆڤ و هونەرمەندانەی کە وولاتێکی وێران و سووتاویـــــــان بە جێ هێشت و روویان لەوپەری قوتب کردووە وە بە تایبەت تەمەنێکی وەکو مامۆستا فایەق بێـــگومان بە ئازارەکانی سنووری خۆیانی بری وە وە ئۆقرەی هیوا کۆتایی پێ هاتووە ، بۆیە ژیانی غوربەتی پێ چاکتر بووە بـــــــــەلام ئەوەشمان لەیاد نەچێت سنووری هونەر بۆ مرۆڤایەتی تابلۆکانی مامۆستا فایەق نوری دیوار بەندیەکی بێ کۆتایی و بێ خالە..چیایی ڤالسیش لە شاری ئاخن ی ئەلمانیا لە چاوی هونەرمەندا هەمـــــوو ئێوارانێک دەمان باتەوە بۆ کوردستانی گۆیژە و ئەزمر...بۆیە تابلۆکان وەکو ئەو ئاوابوونە جارێکی تر لە دایک دەبنەوە.

فایەق نوری سەعید

1934 لە شاری سلێماتی لە دایک بووە

1957خانەیی مامۆستایانی بەشی وەرزش لە شاری بەعقوبە تەواو کردووە

1978 پێشانگای یەکەمی هونەری شێوەکاری لە کتێبخانەی گشتی شاری سلێمانی کردۆتەوە.

1982 دووەم پێشانگای هونەری لەهۆلی قوتابخانەی ئامادەیی خانزادی کچان لە شاری سلێمانی کردۆتەوە.

1984 سێ یەم پێشانگای هونەری پەیکەر سازی لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی کردۆتەوە .

1995 چوارەمیین پێشانگای تایبەتی لەسەر نوحاس لە شاری سلێمانی کردۆتەوە.

1982.1983 بەشداری ڤیستڤالی هونەری کردووە لە شاری هەولێر
بەشداری زۆر پێشانگای جیا جیای کردوە لە شاری بەغداد.

***

## ڕۆژی چاوپێ کەوتنی پەنابەران لــــــە هۆلەندا

**ئامادەکردنی ئاشتی گەرمیانی**
**هۆلەندا..**

ـ کورد لەم ڕۆژەدا وەک نەتەوەیەک ...... دیارو بەرچاوە
ـ هونەرمەندانی کورد.. هاوبەشیەکی بەرچاون بۆ ناساندنی کەلتووری کوردی بە گەلی هۆلەندی .

هەموو سالێک لە کۆتایی مانگی حوزەیراندا دەزگای پەنا بەرێتی لە هۆلەندا هەل دەستێت بە دروست کردنی ڤیستڤالێکی هونەری کەلتووری لە شارەکانی ئەپل دۆرن و ڕۆتردام ، پتر لە 30 تــــا 40 ڕێکخراوی جیا جیا بەشداری ئەم ڤیستڤالە دەکەن وە پتر لە 60 تا 70 کۆمپانیای بلاوکردنــــەوەی میدیایی ئامادە دەبن بۆ بلاو کردنەوەی هەوال و چاوپێ کەوتن..
میللەتی کوردیش وەکو هەموو میللەت و ڕێکخراوەکان بەشداری دەکەن لەو ڤیستڤالەدا بە هونــــەری مۆسیقاو گۆرانی و هونەری شێوەکاری و شانۆو بلاوکراوەی کوردی ، دوو سالی رابووردو بەشێــــک لــــەو چالاکی یە هونەریانە پیشان دانی جل و بەرگی کوردی بوو لە گەل چەند کەرەستەفۆلکلۆریەکــــــی تری کوردی پیشان درابوو .

مانشێتی چاو پێ کەوتن و بە یەک گەیشتن ...دیدار.. ئەو چرایەیە کە دەزگای پەنا بەرێتی لـــــە وولاتی هۆلەندا هەلی داوە .. بەسەر هات و گوێ گرتن لەم بەسەر هاتە زۆر قول و شیرین و تالە.. لەم رۆژەدا خەلک و ئامادە بوان لە رێگایەکی دورەوە هاتوون بۆ تەماشای کەلتوورێکی نوێ و چاووگرتـــن لە هونەرێکی نوێ..بەلام کوردی کوردستان هەر یەک شەیدای ئەوەن کە بە دوای برادەرو ناسیارو کەسانێکی نوێ کە چەند سالێکە لە یەک دابراوون هەتا لە شەری داگیر کەریش دا جیا بونەوە لـــــە یەکتری، هەندێ مرۆڤی کورد هەیە لە رۆژانێکی بەفرو باراندا یەکتریان بەجێ هێشت بەلام بەرێکەوت لە کیشوەرێکی تردا یەکتریان گرتەوە.منــــــی هونەرمەندیش ئەو تابلۆیەم کێشـــــاوە کە لە کاتی هەلهاتنەکەی سالی 1991 پیازە گولیـــلکەیەکی نەرگزە جار لە گیرفانمدا مابووەوە هێناومە دەمەوێ لە ناو ئەم لمە ساردەی سەر دەریای باکووردا بینێژم و نەرگزە جارم بۆ دەربکات.

سالی 1999 چوار هونەرمەندی شێوەکاری کورد. ئاراس حەمە حوسین و ئومەر رەسوول و ئومەر دەروش و ئاشتی گەرمیانی ئامادەیی ئەم ڤیستڤالە بوون هەر یەک بە دووتابلۆ دمانویست باسی کوردو کەلتووری کورد بکەین باسی ئەو ئازارانە بکەین کە لەم قوتبەو کوردستان کۆتاییان نایەت.. لە سالی 2003 لە شاری ئەپل دۆرن پێشانگایەکی تری دیدارە وون بووەکان لەلایەن رێکخراوی ئایدا نیدرلانـــد کرایەوە لەوانە هونەرمەندان ئاراس تەیب و ئاشتی گەرمیانی و حوسام کاکەیی بەشداریمان تیادا کرد، خەونەکانی ئەم تابلۆیانە کۆمەلێک پۆرترێتی دەم و چاوی کورد بوون لە کوردستان بەلام لەریشەدا هەلکێشرابوون و لە ئەورووپادا گیرساوەتەوە  بەلام لەوەش دەچێت وا بە ئاسانی جارێکی تر چرۆ نەکەنەوە، بۆیـــــــە دەم و چاویان لەرەنگ و شێوەدا ووشک ووشک لە کاکلەی ئاسمان و هەتاوێکی سارد دەگـەران.. ئەو ئاوارە بوونە زۆر کەشکۆلی تری لەم قوتبە کردەوە.. میللەتی کوردیش وەکو میللەتـــی مارۆکۆ و توورک لێشاوو نیشتەجێ بونیان وەرمەرگەز داوە بۆیە ئەم رۆژە لە رۆژانی تر ناکات سالێک پەل،کە زێرینەی مۆسیقای کوردی و سالێکی دی هونەرێکی رەنگ کاری کوردی هونەرمەندانی کورد..

کام وولات هەیە نابینی هەر لە سکوتلاندەوە تا خەلکانی رۆژئاوای ئەفەریقیاو بەو لاوە کیـــــشوەری ئاسیاو تا دەگاتە کۆنە هەوار .. هەواری دایک ئەو چیایانەی کە هەموو رۆژ چاویان لە دەستـی رەنگ و کەلتوورە. هەر بۆیە ئەمسالیش شاری ڤالڤایک لە رۆژئاوای هۆلەندا لە ژێر ناو نیشـانی رۆژێک بـــــۆ چاوپێ کەوتنی پەنابەران ی

ئاماده كردوه ئه‌مجاره‌يان له مانگی نۆقه‌مبه‌ری 2005 وه‌كـــو هه‌ر جاره كورسی كورد كه نوێنه‌رایه‌تی كوردستان بكات داوه‌ت نامه‌كه بۆ من هات كه كارێک به گه‌وره‌یی ئه‌نـجام بده‌م له ره‌نک و ئازاری ئه‌و میللەته‌ی كه سه‌دان ساله به ئاكامی ئه‌م رۆژه‌ن.
به سه‌رپه‌رشتی نوێنه‌ری به‌له‌دیه‌یی شاری دورن و كه‌لتووری ئه‌و شاره بالنده‌كان كۆچیـــان كرد تابلۆی به‌سه‌ر هاتی میللەتی كورد بوو .. وه‌كو هه‌ر جاره نوێنه‌ری هیچ له پارته كوردی یه‌كـــان ئاماده‌یی ئه‌م رۆژه نه‌بوون هه‌ر له‌ئه‌م سالدا مانگی مایی 2005 كه به‌رێز ویلیم ئه‌لكنس،نده‌ر كوری شازاده‌ی وولاتی هۆله‌ندا له شاری ده‌مبووش خۆر ئاوای هۆله‌ندا ئاماده‌یی كردنه‌وه‌ی پێشانگای من بوو.. بۆیـــــ،،،ــــه نه‌ک ته‌نها من به‌لكو زۆر له هونه‌رمه‌ندانی كورد به‌بێ پارته‌كان ده‌ربرین له نوێنه‌رایه‌تی میللەتی كورد ده‌كه‌ن. وه هه‌ر ئه‌وان نوێنه‌رایه‌تی سه‌فاره‌تی كوردی ده‌بن بۆ به‌ره‌و پێش بردنی ئاست،ی رۆشنبیری و كولتووری كورد له ئه‌وروپادا.. من بێگومانم له‌وه‌ی زۆر كه‌س هه‌یه به كار نوێنه‌ری میللەتی كورده به‌لام هیچ چالاكی یه‌كی نی یه هه‌تا سه‌ردانی پێشمه‌رگه دێرینه‌كانیش ئه‌وانی له ئه‌وروپا ده‌ژین ئه‌م جاره‌ش تابلۆكان باسی ر له ئه‌رشیفی هونه‌رمه‌ندانی كوردستانه‌وه.

❊❊❊

## هونه‌رمه‌ندی شێوه‌كار خـــه‌لیل كــــاكه‌یی

**ئاماده‌كردنی ئاشتی گه‌رمیانی..هۆله‌ندا**
a.chegani@ hom.nl

ـ لـــه هه‌له‌دنه‌وه تــــــا برۆكسل.......................خه‌مه‌كان وورد وورد ده‌بارێن..

ـ كه‌م ئازارو ئه‌ندێشه‌ی كه‌له‌سه‌ری كورد هه‌یه.. له ره‌نگ و تابلۆدا په‌یم بۆ نه‌بردبێت....

ده‌روێشێكی تری هونه‌رو ره‌نگ.. شه‌یدای عه‌شقی پیرۆزی ووشه‌ی كوردی و به‌سه‌رهاتی ئازاره سووتاوه‌كان و رێچكه‌ی هونه‌رێكی ره‌سه‌ن و مۆدرن له ئه‌مرۆی

شارستانیەت و هاوچەرخی ئەورووپادا.. گەشکە بە هەمـــوو دەم و چاوێکی ئەورووپی دەدات، بە یەک دوو شت ..یەک ڕەنگ و فۆرم دوەمیش هێل لێ زان و خۆشنوسێکـــی لا چەپی بێ دەنگ،، خەلیل کاکەی... پردێکی درێژو پر لە کارەساتی سەیر سەیر و یادەوەری جوان جـوان و لە هەر بن دارێک تابلۆیەک.. لە هەر کۆتەلێک هێلکاری یەک لەهەر گوندێک چەندین پۆرتریت....

هونەرمەندی شیوەکار خەلیل کاکەی پەرەکانی دەگەڕێتەوە بۆ کەرکووک و هۆلی هونەری نوی،، نەخێر لەلای من خەلیل کاکەی دەگەڕێتەوە بۆ مالی خۆیان..کەلە ڕێگای قەسابخانەی شاری کەرکووک بوو، مالێکی ڕەنگ کراو ..خێزانیکی هونەرمەند.. دایکێکی دلسۆزی قژ ماش و برنجی.....بەلام حەزو ئارەزوویەکی زۆر لـــە هونەر، کاکەیی بێ وەستاندن..کاروانـــی هونەری بەردەوام بووە.. لە هێلە ئاسایەکانەوە بۆ سروشـــت و ئەکادیمیەت و پاشان بەرەو سوریالیەت تا چەند سالێک بە تایبەت سالانی 1984 تا 1985 لـــــە گوندەکانی هەلەدن و شەدەلەو کۆتەل و یاخسمەر...هتد. پێشمەرگەیەکی هونەرمەندی چیایی لەگـــەل هونەرمەندانی کورد گاراو بیستوون عەبدول قادرو مەتحەت کاکەی و...هتد. تابلۆ لەدوای تابـــــلــۆ لە دایک دەبێت لەگەل ئەوەی کە ڕۆژانە گوند دەسووتاو دار بـــەرووەکان لە بندا هەل دەکەندران.

بۆنی باروت و پاشماوەی هاوەن دەنگی تۆپ و بۆنی دار بەرووی سووتاوی لا چیاکان ئەو تابلۆیانە بـــوون کە هونەرمەند کاکەیی بێ ڕاوەستاندن هێلەکانی بۆ دەکێشاند..ژیان.. لە چیاو پێشمەرگایەتی تابلـــــۆ درامایەکی چرو پری ئەم سەدەیەی دوایی یە کە هیچ مرۆڤێک لە کاسەی خەیالیدا وونی ناکات.

لە ڕیبازی کارە هونەریەکانیدا هونەرمەند سەرەتا بەو تابلۆیانەوە هاتە مەیدانی هونەرەوە کە شـــــاری کەرکووکی هەژاند بە ڕێبازیکی سوریالی لە هەندێک جاریشدا دەربرین خوازی وە هێدی هێدی هونەرمەنـــــد رووی لە هێماخوازی کرد تا بەرەو هێلە وون بوەکان. جاریکی تر گەرایەوە سەر ئەو قوتابخانەیە هونەری یـە کەسوریالیەت چمکێک بێت و هێما خوازیش ئەو بەشەی تربێت.

بەلام لە ئەمرۆی کارەکانیدا هەموو ئەو قوتابخانانە بە تەواوی سرانەوە لە کارەکانیدا وە پتر پـــــەی بۆ ئەو ڕێبازە هونەریانە بردووەکە ئەمرۆ لە ئەورووپادا پیادە کراوە.. هەندێک جا بۆ ئەو ئارەزوانەی کـــە هەرگیز مرۆڤ وونی ناکات لە ناخیدا.

سالانە تەمەنیکە هونەرمەند کاکەیی لە شاری gent لە بەلجیکا نیشتەجێ بووە.. بەلام لای هونەرمەنـــــد شەو رۆژ جیاوازی نی یە، هەر کارەو هەر ئازارەو لە دایک دەبێت هەر گەلەری و هۆلی کافتریا هەیـــــــە پێشانگا لە دوای پێشانگا دەکاتەوە...زۆر رۆژنامەو میدیا باسی ئەم هونەرمەندە دەکەن وە کارەکانـــــــی بلاو دەکەنەوە ..بەلام بەداخەوە زۆریش... رۆژنامەو میدیای کوردی هیچ کات بە ئەرکی سەرەکی خۆیان نازانن لە رۆژی کردنەوەی پێشانگاکانی هونەرمەندا ئامادە بێت، لە هەلەدنەوە تا برۆکسل نایەلێت هیچ بابەتیک بە سەریدا تێ بەریت.کە ئەندێشەی مرۆڤی کوردی تیادا بێت وە رەنگ و هێلکاریم تیادا نەکردبێت،

تابلۆکانی هونەرمەند پاش بیست سالی تەمەن ئەو تابلۆیانەیە کە بەحال رەنگی تیادا ماوە چونکە رەنگە گەرمەکانی لەم قووتبە ساردەدا رەق بونەوە.. لە چاوەروانی غوربەتیدا.. زۆربەی پێشانگاکانی هونەرمەند کاکەیی لە برۆکسل ئەنجام دەدرێن.. خەلیل کاکەیی هەتاوێکی زەردی کالە وەکو ئەم قوتبە..هەموو رۆژێک بە تابلۆیەک هەل دێت و بەتابلویەکیش ئاوا دەبێت.

***

## دل شکاندنی هونەرمەندان لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە

هونەرمەندان تارا رەسوول و نەریمان و ئەردەلان بەکر وشێوەکارەکانی کورد لەئەورویا و تا دەگاتە شانۆکاران دوا کەس نیین لە زیز بونیان بەرانبەر بە رەنگ دانەوەی و هەلسوکەوتکردنی دەزگاراگەیاندنەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

**ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا**

تازە نی یە کە گوێمان لەوە دەبێت حکومەتی هەرێم یان فلان پارت و لایەن یان دەزگا راگەیاندنەکان دلی هونەرمەندان دەشکێنن ..ئایا بە پشت گوێ کردنیان لە کارە هونەری یەکانیاندا یان لە رووی بێ هاوکاری کردنیانەوون یان من ماندووت دەکەم بەبی هیچ ئاسان کاری یەک.

من هەر ووتومە وەزارەتێک یان دەزگایەکی راگەیاندن بێ پلان کار بکات وە میزاجی بێت لە بەرنامەی کار کردنی بۆ هونەرمەندان وە بە واسیدە هونەرمەندان بانگێس بکەن بێگومان بە هەموو ئەو هات و هەرایەی لی دەکەوێتەوە،بگرە زیاتریش،لەم کاتە ناسکەی ئەمرۆدا وای پێویست دەکرد کە وەزارەت یان حکومەت هەموو ئەو هونەرمەندە کوردانەی لە ناوەوەو دەرەوەی وولات کۆ بکاتەوە وە ئەو دوو دەزگا وەهمی یە هەل بوەشێنێتەوە لە بری ئەوە دەزگایەکی ناوداری چالاک دەست بەکارو پر لە مامۆستایی پرۆفیشینال پسپۆرو لێزان لەهەموو بوارەکاندا کۆ بکاتەوە بۆ خزمەتی هونەرو پێناسەی ناوی کوردی ئەوجا هونەرو کەلتووری کوردی،

زیز کردنی هونەرمەندان کارێکی باش نی یە بۆ داهاتووی ئەو نەتەوەیە کە هەموو چاوەروانی دەکەین،سی دی هونەرمەندان ناکرنەوە پێویست ناکات بێ ئاگای هونەرمەندەکە سیدی کەی بلاو بکەنەوە بۆ ریکلامی خۆتان...ئیدی وەزارەت کاری چی یە؟ من تێ ناگەم،،من ئەوەش دەلێم هیچ کات ئەوەش پشت گوێ ناخرێت لە تازەگەری و جوان کاری یەکانی وەزارەتی رۆشنبیری بە تایبەت فیستیڤالی سینەمایی و کتێب و کەلتووری کوردی، بەلام هەر ئەوان بەرپرسیارن لە دوور بونەوەی هونەرمەندانی کورد لە ئەوروپا وە روو کردنیان بەرەو ستایلێکی تر ئەویش کار کردن لەگەل هونەرمەندە بیانی یەکان..یان نەبوونی راگەیاندنی کورد لە ئەوروپا یان وولاتانی تری جیهان.من هەز دەکەم برایانم لە وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەوە بزانن ،کە هەرچەندە پسپۆر نیین وەتەنها کارمەندنن، ئەوانەی لە ئەوروپا نوێنەرایەتی راگەیاندن دەکەن کەسانی ئاسایی و ناشارەزاو بێ تاقی کردنەوەن لە بواری راگەیاندندا..هەر ئەوەش وا دەکات دلی کەسانی هونەرمەندان و رۆشنبیران زیز بکەن وە دوریان بخەنەوە لە دۆستایەتی خەلکی لای خۆمان و خزمەت کردن بە گەلەکەمان.

بۆیە من لەم منبەرەوە ئاگاداری دەدەمە جەنابی سەرۆک وەزیران وبەرێز کاک فەلەکەدین کاکەیی زۆر پیویستە پسپۆر لەوەزارەتەکاندا کار بکەن وە دلسۆز بن بۆ کەلتووری کوردی نەک میزاجی و واسیدەیی.. بۆ ئەوەی هونەرمەندانی کورد لە کوردستان نەتۆرین.

وی کوردستان دەکەن کە سنوورەکانیان جیا کردۆتەوە.

***

## ڕۆژگارێک لە ئاســـــن و تەلی درکـــــاوی............

ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا..2005

وولاتی ئاسن وتەلی درکاوی.. ئاسن و باروت و تفەنگ و بۆمبا .. لە جەنگێکەوە بۆ جەنگێکی تر..
ڕۆژانە لەگەل ئاسمانی ساف و بێ گەرد و هەتاو.. هەر دوکەلی ڕەشەو ئاسمانی شارەکەمـــــی گرتووە.. دەنگی بۆمباو باروت.. جەنگی جیهانی یەکەمیش هەر ئاوها بووە.. زۆر کەس هات و ڕۆیشت زۆر کەس هیوای بە ژیان هەبوو.. زۆر کەس بە هیوای ژوانێکی تر نەگەرایەوە.. زۆر لاوی جوان جوان .. گولە نیسانەکانیان بە باروتی زەمەن هەلوەریو جارێکی تر چرۆیان نەکردەوە......
زۆر بالندەو ئاژەل لەگەل یەکەم زەنگی کلێسەو یەکەم تۆپە هاوەنی ڕۆژانە هەموو بالندەکـــــان لەسەر تێلی عاموودەکان هەلفرین، جارێکی تر ئەم دەموو چاوانەم نەبینیەوە .. لەگەراجی بەغـدا لە بەغدا هەزارەها دەم و چاوی جیا جیام بینی لە یەک چرکەدا ، هەموو یەک جل و بەرگ وە یەک کلێتەو یەک چاکەتی بۆر هەر هەموو بەرەو لولەی تۆپ و خۆ هەلواسین لە بەردەم ڕۆژ.. هەندێکـــی تر لە نێوان دیوارەکاندا بەند کراون، بۆیان نی یە بۆنی مێخەک و هەتاو بکەن ..هەتا مردن..... لە لیستی تاوانباریدا دژی گوللە و باروت و تۆپن .
پردی پەرینەوەی بەغدا ڕۆژانە چەندەها مرۆڤی پێدا دەپەڕێتەوە شەرت نی یە ئەو مرۆڤانــــــە پاک و خاوێن بن،، هەندێکیان جاسوسن هەندێکی تریش تاوانباری مرۆڤایەتین.هەندێکر تریـــش خۆشەویستی پردی پەرینەوەن،، چونکە مالی خۆشەویستەکانیان لەوپەری پردەکەوەیە،، ئاســـن و تەلی درکاوی.. مندالی بێ دایک و باوک لە شەقام گەورە بوون و زۆر جار جوتیارن وە زۆر جاریـــــش پیاو کوژن و پیاو کوژیان لێ دەرچووە، زۆر جاریش تا دەمرن بێ نازو بێ لانەن ..تەنها یەک نامە و هەوال تەمەنی چاوەڕوانی دەریای ووشکم سەر لە نوێ تەردەکاتەوەوبۆ بەردەوامی ژیان..............
بیست سالی چاوەڕوانی بۆ یەک جاریش هیچ دەنگێک نەبوو.. ئاسن نەما تاقی نەکەینەوە کام میتال باشترە لە کامە، لە ئینگلیز دروست کرابێت یان لە ئەلەمان یان لە ئیتالیا کامەیان زوو تر ژەنـــگ هەل دەهێنێ کامەیان جەرگ برترە.. هەزارەها دەم و

چاوی جیاجیا.. دەست و قاچ و سنـــــــگ و پەراسوو..هەموو ئەو پارچانەمان دەوێت بۆ دروست کردنی هەزارەها مرۆڤی تری ئاسنین بۆ ئـــــەم سەردەمە.. ئێمە لە خۆرهەلات باشترین کارگەی مرۆڤ و لە ناوبردنمان هەیەپێویستمان بە هەمــوو ئەو کەسانە دەبێت بۆ رۆژگارێکی تر و ناوی لێ دەنێیین شەری کیشوەری و تەقاندنــــــەوەی زەوی و دابەش کردنی بۆ دوو دەولەت.. ئەم بەرو ئەوبەری زەوی لە بۆشای ئاسماندا پێویستیمان بە ڤیـــزا دەبێت بۆ ئەوەی بچینە ئەوبەرەوە و سەردانی کەس و کارمان بکەین چونکە لەوە دەچێت هەردەم ژیان و کار پێویستیان بە یەکتر هەبێت..

هەندێ کەسی تر پتر لە پێنج هەزار مرۆڤی بێ جل و بەرگ و بێ پێلاو زۆریان بێ سەرو دەست پەریون لە بیابانێکی ووشک گەراونەتەوە و دەم و چاویان رەش و خەلوز دەلێن ئێمە پاشماوەی ام المعارکین....

هەندێکی تر وا لەسەر چیایی گردەمەنن و گولیان دەرکردووە وونن تا ئێستاش دەگەرێن بە دوای کەس و کاریانداو هەر لەو دۆلەن و رێگایەک نی یە بیانگەیەنێتە سەر شەقامی قیر. لە بۆنی بارووت کـــاس بوونەو کەس گویی ی لە کەس نی یە .. زۆریان ناوی خۆیان لەبیر چۆتەوە و نازانن لە کوی وە هاتوون هەر دەرۆن و بە سەر لاشەی مردووەکاندا هەنگاو دەنێن.هەندێکی ترم بینی لە شام زەمانە تەمەنێکـــــە بە کۆچ بەرێتی هاتوەتە شام و مندالە چاو شینەکەی و دایکیان لە سێ دارە داوە لە شارە عروبـــەکەی موعتەسەم باللە.. هەندێکی تر بە شایەتی و بە مۆقەت تەلاق دراون تەنها بەمۆقەت و سەرو قـــــــژ سپی و دەم و چاو چرچ و لۆچ بە دوای مەلاکەدا دەگەرێیین تەلاقی موەقەتی زەمەنی ئاسن چــــــــالاک بکەینەوە.. هەندێکی ترم بینی لە سەر شەقامی زاخۆ دەسکە نیرگزە جاریان پێ بوو ودەیان فرۆشـــــــت نە دەستەیەک و نە دوو دەستە هەر لە موسلەوە تا زاخۆ هەر مندال و گول بە دەستە چاوەروانن تەنهـــا یەک دەسک بفرۆشن..بەلام کێ دەیان کرێت گولەکانیش هەتیەن بێ باوک و دایک.. کێ هەیە پارە بــدات بە گول بە هەتیو...

نامەکانم مەکەنەوە ،هەرچی نامەیە لە چیاوە هاتوە بۆ خۆشەویستەکان هەر هەمووی لە یەک ژووردایەو هیچیان نەکراوەتەوە تەنها مۆری هاتنە ژوورەوەی لێ دراوە،، نابێت بگاتە دەستی خاوەنەکانیان .......

لە هەولێر.. کابرایەک ناوم بیست ووتبوو من کچەکانم بە کرێ دەدەم.. بۆ ئەوەی دوو کورسی پێ بکـــــرم مندالەکانم بەکرێ کار دەکەن دەمەوێ خانووەکەم تازە بکەمەوە.. لە

كەركووك من دەچم هەوال بـــــۆ ئەمن و ئیستخبارات دەبەم كە ئەمشەو پێشمەرگەیەك لەو ماڵە نوستبوو با خاوەن ماڵەكە هەڵ بواسن....

لە سلێمانی،، من بە رۆژ ئیمزای دەكەم و ملی زۆر كەس دەشكێنم و بە شەویش هەر خۆم تەقە لە خـــۆم دەكەم،، لە دهۆكیش ئەمشەو دەچین بۆ بۆتان ملی خەج لە بندا بە چەقۆ دەبرین و سبەیی بە پۆستـــــی ئیكس پریس دەینێرینە بەغدای ئازیزمان... لە بەسرەش كێ بڵێ بە پیاوە دڵسۆزەكان تۆ راكردووی.. بــێ یەك و دوو وەكو مریشك پەلەكانی لێ دەكەنەوە .

بێ دایك و باوك گەورە بوون لە شەقام تەنها یەك نانی رەق و گوڵێكی سپی.. پایزەكانیش..سەردانــــی قەبرسانەكان دەكەین گۆڕەكانی هەڵ دەدەینەوە من تەنها یەك گوڵ و نامەم وونكردووە .. یەك یـــــەك لا قەبرەكان هەڵ دەدەمەوە هەندێ جار خەنجەری خیانەت دەدۆزمەوە هەندێ جاریش مرۆڤی بێ گونـــا بە بێ تاوان كوژراوە بە هەڵە .. زۆر جاریش دەم و چاوەكان دەناسمەوە كە لە قوتابخانەی سەرەتـــای بووین ئەم دەم و چاوە لەگەڵمدا بووە ئەمەی تریانپۆلیس و شورتە بوون كە داوای ناسنامەیان لێ كردیـــن ئەمەی تریان هاوسێ كەمانە و ئەوی تریشیان ئەو كچە بوو كە سەریان بری ،چونكە حەزی لە لاوێـــــك بوو لە تەمەنی خۆیدا.

ژمارە نەما لە بەری نەكەم هەر لە ساڵی 1919 وە تا ئەمرۆ 2005 هەرچی كێڵە قەبرەكان هەیە شیین كراوە بۆ ئەوەی كەس نامەكانیان نەخوێنێتەوە بە ئاشكرا كەسیش تەماشای ئازەرەكانیان نەكات.......

ئەم بیرەوەریانە هیچ كات لەبیر ناكرێن و كاڵ نابنەوە ئەو كاتە كاڵ دەبنەوە كاتێك مرۆڤ كۆتایـــــی بێت. بەڵام بێگومان بە دوای ئێمەش هەر باس دەكرێت ئاسن و تەلی دركاوی و بیرەوەری تـــــاڵ...

❊❊❊

## فلیمی پەرینەوە لە غوبار..پەرینەوە بوو بۆ جیهان...

ئاشتی گەرمیانی

...کارێکی هونەری وەزارەتی رۆشنبیری و سەتەلایتی کوردستان تی ڤی...

لـە ڤیستڤالی فلیمی سینەمایی2006 لە قاهیرە ی وولاتی میسر ..کورتـــــە فلیمی کوردی کوردستانی عێراق بە ناوی پەرینەوە لە غوبار لە کۆتـــــایی مانگی نۆڤەمبەر وە لـــــە 6ی دیسەمبەری2006 وە2006/12/30 پشان دەدرێـــــت..دەرهێنەری فلیمەکە هونەرمەند شەوکەت ئەمین کوردی وە هونەرمەند نێچیرڤـــــان ئەرگووشی سەرپەرشتیاری ئەو کارە فلیمە بوو کە پەرینەوە لە غوبار بوو بە پەرینەوە بۆ جیهان.
دەمێک بوو میللەتی کورد خەوی بەوە دەبینی کە ئـــــازارەکانی میللەتی کورد بگاتە هەموو مالێک لە دونیادا..تەنها کورد بە پشمەرگەو ئەفسانەی ئازایەتی نەنـــــاسرێت بەلکـــو داهێنانەکانی لە سینەماو شانۆ و شێوەکاری و هونەرەکانی تـــــردا دەدۆزرێتەوە..لاوانێک هەن لە کوردستاندا خاوەن داهێنــــــانن وە ئەمرۆ ئەو هونەرەیان زۆر بە ئاسانی دەگاتە هەموو جیهان،
بۆچوون لەلای ئامادە بوان ئـــــەوە بوو کە بەراستی دەربرین بــــــوو لە مرۆڤایەتی و دونیایی کارەساتی شەر لە ناوچەکەدا وە کۆتـــــــــــــایی هاتە بە رژێمێک کە ناوی دیکتاتـــــۆریەتی سەردەمە.هەروەک لە کوردستان تیـــڤی باسی لێوە کرا.
هەندێک کەس لایان وا بـــــوو کە کورد بۆی نـــــــی یە باس لە هیچ شتێک بکات تەنـــانەت زمانی خۆی ئەمسالی عزەت ئەبوعۆف کە پێی ی ناخـــــۆش بووە فلیمێکی کوردی لە نــــاو لیستی پیشان دانی هونەری نێودەولەتی قاهیرەدایە..........وە ئـــــەو راو بۆچونە شۆڤینـــــیانە تا کاتێکی دوور هـــــەر دمێنێت چونکە باوەریان نەدەکـــرد ئاوها بە ئاسانی رژێمێکی عەرەبی شۆڤـــــــــــــینی بن گۆر دەبێت..لای ئەو مرۆڤانە یەشتان یەکێتی عەرەبی هەر ماوە وە هەر خۆیان سەیـــــــــدی ئەو هونەرە دەبن...بەلام بە خەباتی میللەتی کورد ئەمرۆی ئەم هونەرە ئەم داهێنانەی خستەوە کە کەســــانێکیش لەناو هۆلی پیشان دانی ئەو کورتە فلیمەدا داهاتـــــــوویەکی چاک بەدی دەکەن لە داهاتووی فلیمی کوردیدا...

بەلام هەروەک هونەرمەندان لە شاری هەولێـــری پایتەخت باسیان لێوە کرد دەبێت سینەمایی کوردی بودجەو هاوکاری یـــەکی زۆری دەوـــــێت بۆ سەرخستنی ناوی سینەمای کوردی دوور لە خزمایــــــەتی کورسی.. پەرینەوە لە غوبار ئەو باسەیە کە هەر کورد لێیـــــووردن ودپی گەورەیی هەیە بۆ پاراستنی مرۆڤایەتی لە ناوچەکەدا..کورد بەو هـــــــــــەموو زەحمەتی و خەباتە خوێناوی وە هەر ئەو باس لە ئازاری گەلەکەی و مرۆڤایەتی دەکات.....

من ئەو کارە بە کـــــــارێکی پیرۆزی دەدەمە قەلەم وە دەست خۆشیان لێ دەکەم بەو هیوایەم کە کـــــــاری گەورە تر لە کوردستانی ئازادا ئەنجام بدرێت...با کەسانی وەکو ئەبو عۆفـــــــــــیش هەر لە سێبەری وەحدەی عەرەبیدا نوێنەرایەتی خۆیان بکەن...

❊❊❊

## هونەرێک .....لە غوربەتەوە.

**..ئاشتی گەرمیانی..**

زۆر پاکتر بە بێ روتوش و سیما گۆرین هونەرێک لە هونەرەکانی دونیا لە دونیایی غوربەت لەدایک دەبێت، ئەو هونەرەی کە دوورە لە خزمایەتی و برادەرایەتی و واسیدە داری لە کوردستانی ئازادی و دیموکراتیدا.

کۆچی هونەرێک لە کوردستانەوە بۆ غوربەت بۆ پەنابەرێتی ژیانی مرۆڤی کورد لە سەر گۆی زەویدا بلاو بونەوەی بۆ هەموو کیشوەرەکانی دونیا.. رەنگ دانەوەو لەدایک بونێکی دروست کردوە، ئەو هونەرەی کە دوورە لە هەموو روتووش و خزمایەتی و برادەرایەتی یەک.. پر بێت لە داهێنان و هونەرو تازەگەری و روو کرنە گێرانەوەی هونەرەکانی ژیانی مرۆڤی کورد لە بەسەرهات و گێرانەوەی کارەساتی سەدەیەک... ئەو مرۆڤەی کەبە ئاسن و ئاگر مامەلەی لەگەلدا دەکرێت تا ئەمرۆی وەرگێرانی ژیانی مرۆڤایەتی سەردەم، بۆیە لەدایک بوونی ئازارەکانی ئەم سەردەمە زۆرترو قوول ترو چر ترن.. چەندەها لاپەرەو گێراوەی زەمەن باسی ئەم بەسەر هاتەی کردووە...

هونەرمەندانی کوررد لەدەمی نایی و بلوێرو ئاوازەوە ئاوازی ئازاری جەستەیەک باس دەکەن..باسی مرۆڤێکی لەش بریندارى هەنجن هەنجن دەکەن.. تابلۆکان لەو سەری قوتبەوە تائەوسەری قوتب باسی گێراوەی هەندێک لەو ئازارانە دەکەن نەک هەر هەمووی.

شانۆکارەکان بوون بە ئەکتەری رۆژانە لە نواندنی پەنابەرێتی قوتب و لەش سوتاندن و دەربەدەری کۆلانەکانی جیهان.. کەم کەس هەبوو لەسەر لاشەی لاوەکان نەگریاو نەشەوتێنرا. هونەرمەندانی کورد لە دەرەوەی وولات زۆر کارامە ترو ئاگادار تر کاریان بۆ ئەم رۆژاگارە کردوە بۆ نەهامەتی یەکانی ژیانی مرۆڤی کورد.

زۆر پێویستە نەخۆشیەکانی کوردستانی ئازاد نەگاتە ئەوروپا چونکە بەهەموو کەم تەرخەمیەکانیانەوە زۆر لە هونەرمەندان تووشیٚ لاوازی کار دەکەن بۆ نموونە .. هونەرمەندانی کورد لە ئەوروپا لەبەر زۆری گەندەلی لە کوردستان بەتایبەت لەناو دەزگای یەکێتی هونەرمەندان وسەندیکای هونەرمەندان پێویستیان بە رێز لیٚ نانی ئەوان نی یە چونکە ئەوان مانای رێز لیٚ نانیان تاریک کروە.. ژیان لە کوردستان بووە بە کارو پارە.. نەک داهێنان و تازەگەری و ئاوەدان کردنەوە.

هونەرێک لە غوربەتەوە زۆر کارامەترو بە جمو جۆل ترە زۆر ئەکتیڤ ترە بۆ ئەمرۆی هونەری کوردیپتر کاریگەر ترە بۆ دۆستەکانی میللەتی کوردلە ناو کیشوەرەکانی دونیادا.... هونەرێک لە غوربەتەوە تەمەنی مانەوەی زیاترو لە کەرەستەو ماتریالدا بەهێز ترە..سەرەرایی ئەوەی هونەرمەندی کورد لەسەر بودجەی خۆی دابینی دەکات....

***

ئاشتی گەرمیانی

..بەکارهێنانی زۆرترین پاسکیل لە ئەوروپا ئەویش هۆلەندایە ..

.. کێ پاسکیل لێ دەخورێت.
.. چ کات پتر خەلک لەهۆلەندا پاسکیل بەکار دەهێنێت..
.. هەموو هۆلەندا بە پاسکیل ببرە بە رێگاو بانی تایبەتی..
.. یادەوەری یەک لەگەل پارێزگاری شارەکەم بە پاسکیل..

لە وولاتێک وەکو هۆلەندا لەبەر ئەوەی پانتایی رووبەری تەختە خەلکانێکی زۆر پاسکیل بەکار دەهێنن لە ژن و پیاو مندال. خێزان نی یە پاسکیلی نەبێت ، بۆیە بەکار هێنانی کارێکی ئاسایی یە وە لە جیاتی ئۆتۆمۆبیل باسکیل رۆژانە بۆ چوون بۆ کارو هاتنەوە بەکار دێت، قوتابی خوێندن رۆژانە بەکاری دەهێنن یان زۆر جار مرۆڤی بەتەمەنیش بۆ تەندروستی ژیان مندال بۆ یاری کردن و دەرچوون لەگەل کەس و کاریدا .
دانشتوانی وولاتی هۆلەنداڵەرۆژانێک کە باران نەبێت پاسکیل بەکار دەهێنن یان زۆرینەی خەلک لە هاویندا یان رۆژێکی گەرم دا بۆ دەرچوون و کاری بازاری پاسکیل بەکار دەهێنن. وەکو ووتمان چوون بۆ قوتابخانەو کارو کارو باری رۆژانە.. هەندێک جار ئەو مرۆڤانەی کە ئارەزووی وەرزشیان هەیە، نەک تەنها لە هاویندا بەلکو لە رۆژگاری زستانیشدا وەرزشی خۆیان دەکەن بە برینی چەندەها کیلۆ مەتر لە درێژی یان پانتایی وولاتی هۆلەندا. زۆر نەخۆشی هەیە لە لەشی مرۆڤدا بەکاری وەرزش و پاسکیل لێخورین چارەسەر دەبێت ئەمەش لە راپۆرتی دکتۆرەکاندا هاتووە. کرینی پاسکیل لەوولاتی هۆلەندا ئاسان و ئاسایی یە، چ تازە بێت یان کۆن و بەکار هاتوو، بێگومان پاسکیلی بەکار هێنراو زیاترە وەک لە نوێ. وە پتر مرۆڤ پاسکیلی بەکار هێنراو بەکار دەهێنێت، مرۆڤ لەو وولاتە لەبەر گرانی بانزین و ئۆتۆمۆبیل بەکار هێنانی پاسکیل کارێکی ئاسان و کەم مەسرەفە. وولاتی هۆلەندا وا رێک کراوە کە رێگایی پاسکیل بە هەموو شارو شارۆچکەیەکدا بروات وە رەنگی رێگاکەش جیا بێت لە رێگاکانی تر لەناو هەر شاروانی یەکدا تایبەت مەندێتی ئەو شارە پارێزراوە بۆ

دروست کردنی ریگای تایبەتی پاسکیل جیا لە هاتوو چۆ و ئۆتۆمۆبیل. وە شارەوانی سالانە لەگەل گۆرانی شارەوانی نەخشەی نوێ بلاو دەکرێتەوە.نەخشەی پاسکیل لە هۆلەندا تایبەت مەندێتی خۆێ هەیە واتە ئەگەر بتەوێت بچیت بۆ جێگایەک ئەوادەتوانیت بە پاسکیل بچیت بەو نەخشەیەی کە هەیە.. نەخشەی هەموو شارەکانی هۆلەندا لەگەل روون کردنەوەی جێگاکە. بێجگە لەوەی کە زۆر جێگا دەست نیشان کراوە بۆ مانەوەو نوستن و پارک لەگەل هێمای هاتووچۆی شارەکان و ناوچەکان کە چەند کم ماوە یان لە کوێ وە بۆی دەچیت. ریگای پاسکیل لە هۆلەندا لە زۆر ریگای تر لە وولاتە ئەوروپی یەکان پێش کەوتوترە.

رۆژێک من خۆم تا بازاربە باسکیل چووم کە 3 کم دوورە لەمالەوە کەسێک بوو بەهاودەمم لە ریگا تەماشام کرد پارێزگاری شارە بۆ وەرزش دەرچووە. پاش چاکو باشی تاوێک وەستایین و باسی هونەرو کەلتوورمان کرد ئەو بە پاسکیل بەرەو ناو شار منیش بەرەو گەلەری نوێ ی هونەر لە واتر ستریت....پاسکیل ژیانی رۆژانەی ئەو خەلکەیە لە هۆلەندا.

❊❊❊

## خاتوو کۆبی کریمرس 10 ساڵە خزمەتی پەناهەندە دەکات

میللەتی کورد بۆ من سومبی ئازادی یە.. چونکە میللەتێکە بێ وولاتە ..
.. بۆ زۆربەی نەتەوەکانی جیهان کارم کردووە.. لەئاسان کاری زمان و کاریان و کێشەکانیان .. میللەتی کورد تایبەت مەندێتی یەکی خۆی هەیە بۆ من..........
گفتووگۆو لێدوان..

**ئاشتی گەرمیانی... هۆلەندا ...**

له سێپتەمبەری ساڵی 1997 بۆ یەکەم جار مرۆڤێکی هونەرمەندم ناسی لەبواری مۆسیقا کەلە دەزگای پەناهەندە لەشاری رۆزندال کاردەکات کە دەکەوێتە رۆژئاوای وولاتی هۆڵەنداوە. کە بێجە لەوەی یارمەتی زمان و کەلتوورو پەیوەندی مرۆڤی پەناهەندە دەدات لەگەڵ دەزگاکانی حکومەت لە پایتەحت یان لە ساری لاهای زۆر جار پەیوەندی کردن بە مەکتەبی سەرۆک وەزیران و مەکتەبی شازادەی هۆڵەندا بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو کێسانەی کە پەناهەندەکان بەرەو روویان دێت لەم وولاتە.. خاتوو کۆبی کریمرس بێجگە لە لەو خزمەت کردنانە بۆ خۆی مامۆستایی هونەری مۆسیقایە هەر لەبەر ئەوەسە بووین بە دۆست و برادەری یەکتری کە هونەر جیاوازی نێوان وولاتان نازانێت وە یەک زمانە بۆ کەلتووری جیهانی هەر ئەوەش وای کرد کە زۆر کار بەئەنجام بگەیەنین.. لەوانە رۆژی نەورۆز لەسالی 1997 وە لەم شارە ئاهەنگی بۆ بگێردرێت.. 21 نەورۆز ببێتە رۆژێکی میولتی کەلتووری وولاتانی تریش وەکو پەناهەندەی خەڵکی ئێران وئەفغانستان و رۆژئاوای کیشوەری ئەفەریقیاو و خەڵکی تری کیشوەری ئاسیا. 10 ساڵ کار لەگەڵ پەناهەندە بەراست ماندوو بونێکە کە جێگای کار کردنی بەخۆیەوە گرتووە.. بۆ مرۆڤێکی هۆلەندی کە کەلتوورێکی ترە وە تایبەت مەندیەکی تری هەیە لەگەڵ وولاتانی دونیا،
زۆر مرۆڤی کورد بەبریاری وەزارەت کەوتنە سەر شەقام وجێگایان نەکرایەوە لەم وولاتە بەلام هەولەکانی خاتوو کۆبی کیرمرس مرۆڤی لەشەقامەوە هێنایەوە بۆ ناو ماڵ.. واتە لە ژیانێکی رەسەوە بۆ ژیانێک کە بەچکەکانیان ئارام بن بۆ داهاتوو، بێ ناسنامەیی مانەوە یەکێکە لە کارە هەرە گرنگەکانی ئەمرۆ لە ئەورووپادا یان بەدوا چوون بۆ کاری ئەم دایەرەو ئەو دایەرە.. لەساڵی 1999 رۆژانە 350 خێزان خۆیان بە پەناهەندە ناونووس دەکرد لە وولاتی هۆڵەندا.. کار کردن بۆ ئەو هەموو خەڵکە بەراستی شەو رۆژی دەوێت، بێ ئەوەی بزانیت کێ لەکامە باشترە.. خزمەت کردنی پەناهەندە کوردەکان بەراستی جێگای پەنجەی خاتوو کۆبی پێوە دیارە.
لەساڵی 1999 یەکەم پێشانگای هونەری کوردیمان لەساری رۆزنداڵ کردەوە بە ئامادە بونێکی زۆرەوە لە خەڵکی پەناهەندەی کیشوەرەکان و خەڵکی هۆلەندی بەهەوڵی ئەم مرۆڤە بووە.. بۆ زیاتر ووردبونەوەلەکارەکانی ئەم خاتوونە من ئەم پرسیارانەم ئاراستە کرد..

1. بەرێزتان دە ساڵە سەرقالی کاری خزمەت کردنی پەناهەندەن لەشاری رۆزنداڵ.. چیت نیشانە کردووە؟

وەڵام، دوو خاڵ هەیە پۆزەتیف و نەگەتیف.. یەکتر ناسین لە دڵەوە بۆ دڵ .. ئەو مرۆڤانە لەدونیادا وەکو یەکن .. پێویستە لەدڵەوە راستی یەکان باس بکەن. ئەوی تریان مرڤانێکی تر لە شەرەوە هاتوون وەکو یەک نین .. من لەم وولاتە ئازادم هەست دەکەم کەشەر چ رەنگ دانەوەیەکی هەیە ، بزر بوون هەیە ، ئەو خەڵکە لەشەر وێران بووە من لە ولاتی ئارامم چونکە شەر لەوولاتی من دوورە...

روە نەگەتیفەکەی بەداخەوە خەڵک لەوولاتی خۆی زۆری خوێندووە بەلەم کە هاتۆتە ئەوروپا کارێکی نارێکیان داوەتێ یان نایان وێت پتر بخوێنن بۆ ئەوەی کاریکی باش وەربگرن بۆیە روو لە کۆمپانیای کاری لەش دارزاندن دەکەن لەبری مامۆستاییو پلەی بەرزتر، ئەمانە زۆر ئازارم دەدەن.

2. پاش ئەم 10 سالە میللەتی کوردت چۆن هەڵ سەنگاندووە؟

وەلام. زۆر بەداخەوە میللەتی کورد بێ وولاتن .. میللەتێکی ژمارە زۆر و بەلام بێ وولات هەر وەک فەلەستینی یەکان.

3. کاری داهاتووت یان پلانی نوێت چی یە؟

وەلام. من حەز دەکەم کارێکی بچووک بکەم بەلام جێگا بگرێت بەتایبەت لەرێگای دەزگای پەناهەندەیی وە ببم بەمامۆستایەکی یونیڤرسیڵ واتە گشتی.

لەساڵی 2000 لەگەڵ خاتوو کۆبی بەرنامەی ئەوەمان هەبوو کە کۆمەلەیەک لە دەستەی پەنابەرانی عێراقی دابمەرزێنین بۆ ئەکتیڤ کردنی کارو چالاکی ئەو پەنابەرانەی کە لە شاری رۆزندال دەژین یان لەدەوروبەری بەلام بەهۆی بوونی تورکەکانەوە لەناو کۆمۆسینی یان ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگای شارەکە ئەو کارە سەری نەگرت تا لەم مانگەدا پاش 7 ساڵ منیان بەئەندامێکی ئەنجومەنی پارێزگا وەکو کاری پەنابەرەکان قبوول کرد.

من هیوادارم لەداهاتوودا خاتوو کۆبی کوردستان بە ماڵی خۆی بزانێت وە کوردستانیش خاتوو کۆبی بە دۆستێکی راستەقینەی مرۆڤایەتی بناسێت..

***

....به بێ هونەری شێوەکاری کوردستان لە گوندێک دەکات....

ئاشتی گەرمیانی..هۆلەندا

ئەمە تەنها ووتەی من نی یە...بگرە هەر لە هونەرمەندە ناسراوەکانی کوردستانەوە تا دەگاتە ئەوانەی وا لە ئەوروپا دەژین ئەو باوەرەیان هەیە.....کە بە هۆی لێ نەزانینی راوێژکارە شێوەکاری یەکانەوە هونەری شێوەکاریێ بەرەو مردن دەچێت لە کوردستاندا.

رۆژگارێک ئەوەی سەلماندوە کە مرۆڤ واز لە داخوازی یەکانی خۆی نەهێنێت وە بەردەوام داوای بکات وە چاویش لە کەم و کوری یەکان نەپۆشێت.. ئەزانم تام و بۆنی کورسی وەزارەت خۆشە.. وە پارەکەشی حەیاتە بەلام ئەگەر بەقەدەر ئەو پارەیە کار بکەین وە کوردستان ئاوەدان بکەینەوە هەلبەت کوردستانیش لە شار دەکات وە بۆنی ئاوەدان بونەوەی شارستانی لێ دێت..ئەم راوێژکارە مۆدرینانە وای لێ هاتوە تەنها لە مالەوە بۆ وەزارەت وە بە پێچەوانەوە؟؟ کارو باری ئیداری ئەوەندە زۆرە بە راستی ماندوو دەبن ..ئیمزا زاید ئیمزا؟؟
ئەوەی هونەرمەندی کارامەیە لە کوردستان وە خاوەن پسپۆرو شارەزایی کاری هەیە بەقەدەر نیو مووچە کاریان نەداوە بە دەستیان.. هەموو هونەر ئەمرۆ لەرێگای دوو دەزگای ناهونەری وە دەروات بە رێگاوە ..من حەزم دەکرد بلێم هونەریین بەلام هونەرەکەیان نابینم لە کوردستاندا؟؟ وە ئەم جۆرە بۆچونانە ئاژاوە گێری نی یە بڕواتان هەبێت... ئەوەی لە کوردستان گەراوەتەوە کەف و کوول دەکات لە ئازاری کەم تەرخەمی بۆ وولات، پاشان ئەوەی 23 سال پێش ئێستا کوردستانی بە جێ هێشتوە هەر ئاوهای بینیوەتەوەلە هونەری شێوەکاری ئاسان تر نی یە وە کەم مەسرەف تر نی یە بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان...ئەگەر خەلکی لای خۆمان بەرپرسەکان بێن بۆ ئەورووپاو چاو لە مۆزەخانە جیهانی یەکان بگرن زۆر لە کاری هونەرمەند دارا حەمە سەعی دەبیننەوە..کەچی لەلای ئێمە هیچ پەرەیەکیان بەو هونەرمەندە گەورەیە نەداوە..نەک تەنها ئەو بەلکو چەندەهای تری وا هەن ..هەر لە زاخۆ وە تا بەدرەو

جەسام،چەندەها داهێنەری کورد هەیە..لەم ماوەیە لە هەولێری پایتەخت پەیکەری برای هونەرمەندم کاک ئەحمەد زەهاویم بینی کە کرایەوە...وەلاهی من گریانم بۆ هونەری شێوەکاری دەهات بەتایبەت پەیکەرسازی کەوا چۆن ئابرووی ئەو هونەرەیان برد.نە لە رووی ئەکادیمی یەوە ساغ بوو وە نە لە رووی لەش و لاری یەوە.

ئەگەر هونەریش نەبۆتە خزمە خزم و برادەرایەتی ئەدی بۆچی ئەو هەموو دەست رەنگینەمان هەیە پلانی بۆ دانانێن بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان.من تێ ناگەم تۆ بڵێیت وەزیرەبەرێزەکان ئەگەر هونەرمەندیش نیین ئەم راستی یە نەخوێننەوە یان نەی بینن...کە دۆو دۆشاو تێکەل بووەو...کوردستانیش لە گوندێک دەکات....

***

## پەیکەری پێشمەرگە لەناو جەرگەی شاری کەرکووکدا

**ئاشتی گەرمیانی.. هۆلەندا**

ئەمرۆ لەهەر کات پتر پێویستیمان بەو پەیکەرە پێشمەرگەیە یە کە لە گەل بە کوردستانی بوونی کەرکوک بسەلمێنێت بە هونەر.

بۆ پشت گیری کردن لە کەرکووک لە هونەری کەرکووک کەلتوورو زمان و داب و نەریتی ئەو شارە کە فێری زمان و خوێندن بووین بە کوردی تیایدا .. من وەکو هونەرمەندێک بە پێویستی دەزانم بۆ پشت گیری کردن لە پرۆسەی ئاوەدان کردنەوەو بە کوردستان بوونی کەرکووک کەلەم سەدەیەدا بیسەلمێنین لەهەر کات پتر لەبری دوو دەزگای مردوو وەکو سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان لە کەرکووک وە یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان لە کەرکووک دروست کردنی پەیکەری پێشمەرگە لە ناو جەرگەی کەرکووکدا کارێکی نیشتیمانی و نەتەوەیی یە.

من دوو سێ شت هەیە دەیخەمە بەر چاوی رۆشنبیران و نوسەران و سیاسەت مەداران ئەگەر بیانەوێت پشت گیری لەشاری کەرکووک بکەن وە بە کوردستانی بزانن..ئەوەش

ئەوەیە کە دەبێت چاوەروانی بەغدا نەکەن بۆ خزمەت گوزاری خۆیان پتر کەرکووک ئاوەدان بکەنەوە بە رێگاو بانی ناو شارەکەی کە وێرانەیە.. وە ئەو پەیکەرەی من باسی دەکەم با لە رەحیم ئاوا بێت با لە شۆرجە بێت با لە پارێزگا بێت بۆ ئەوەی ئەوەی ووتی کەرکووک کورد نی یە پەیکەری ئەو پێشمەرگەیە شاهیدی حاڵ بێت بۆ هەر کەسێکی دوژمن لەهەر جێگایەک بێت.پەیکەری پێشمەرگە خەونی هەموو شەهیدێک سەرکردەیەک ئازادی خوازێک دەبێت کاتێک پەردەی لەسەر لا ببرێت.

خەونی پێشمەرگە خەونی ئەمرۆ نی یە بەڵکو لەهەموو شۆرشەکانی کوردا پێشمەرگە پێشەوا بووە بۆ خۆ بەخت کردن .. بۆیە من بە پێویستی دەزانم وەکو مافێک لە کەرکووکدا پەیکەری هونەری پێشمەرگە بە تەکنیک و دارشتنێکی هونەری بەرز ئەنجام بدرێت .. ئەم کارە کاری جەماوەرە کاری دەزگاکانی حکومەتە کاری هەرێمی کوردستانە .. پاشان کەرکووک پێویستی بە جوان کاری هەیە لە هەر کات پتر ،، کەرکووک لە گوندێک دەکات .. بەو شێوەیەی کە مرۆڤ سەردانی بکات پێویستە کاری جوان کاری وا بکات کەرکووک بەرەو شار ببات .. چ بە رازاندنەوەی باخچەو پاک کردنەوەی شارەکە وەچ بە جوان کاری فلکەو ناو شارو گەرەکەکان .. وە چ بە دروست کردنی بەنداوی ئاوی.. ئەگەر هەر چاوەروانی بەغدا بین کەس شارەکەمان بۆ ئاوەدان ناکاتەوە کەس نایەت دەستمان بگرێت بۆ ئاوەدان کردنەوەی .. ئاوەدان کردنەوەی کەرکووک ئەرکی هەموو لایەکە بە پرۆژەوە نەک بە ووتیان و ووتمان .. وەکو دوو دەزگای مردوو و گەندەل لەناو شاری کەکووکدا کۆمەلەی هونەرمەندان و یەکێتی هونەرمەندان کە بودجەی لەهەرێمەوە دێت.. من رەخنەیان لێ دەگرم چونکە تا ئێستا نەیان توانیوە وەکو پارێزگای کەرکووک شارەکە ئاوەدان بکەنەوە بە هونەر .. هونەری مندالان هونەری لاوان هونەری مۆسیقا هونەری شانۆ ... گوێمان لە ڤیسڤالێک نەبوو بەهەر حال .. خەمی من تەنها لەوەدا نی یە بەڵکو رێگای کەسی تریش نادەن ئاوەدانی بکاتەوە.. پشت گیرشت ناکەن ... نمونە زۆرن.. بۆیە من وا دەبینم کە ئەمرۆ لەهەر کات پتر کاتی ئەوە هاتووە کە پەیکەری پێشمەرگەی کوردستان لە شاری کەرکووک ببێتە هێمایەک بۆ ناحەزانی میللەتی کورد لە هەموو جیهان.

❊❊❊

**ئاشتی گەرمیانی**

قەلەم و نوسەرو پێشمەرگە .... ئازدای و دیموکراسی لە نێو ژیانی کۆمەلانی کوردا بۆ پرۆسەی بە هاوچەرخ بوونی یان دروست کردنی رۆژنامەگەری کوردی لە کوردستان و دەرەوەی کوردستانندا..بەو یادە پیرۆزە بۆ بەرزرا گرتن وپەرەپێدان بە رۆژنامەگەری و نوسەرو ئەوانی دروست کردنی رۆژنامەگەری کوردین گۆران کاریەکی تەواو لە رۆژنامەی کوردیدا رو بدات ..رۆژنامەکانی باسەرەو ئاڤێستاو ژین و کوردستان وزۆر رۆژنامەی زیندوو کە ئەمرۆ یادیان دەکەینەوە بۆ بەرز را گرتن لە حورمەتی دروستکردنی راگەیاندن و رۆژنامەگەری ئێمە جەلادەت بەدرجان سومبلی ئەو رۆژنامە گەری یەیە کە نەک ئەمرۆ بەلکو سالانێکە یادی دەکرێتەوە بۆ بەرز راگرتن..زۆر پێشمەرگەی نوسەر هەبوون شەهید بوون لە پێناوی کاری رۆژنامەو رۆژنامەگەری کوردیدا...

ئەگەر بەو خەبات و هەول دانە نەبوایە بێگومان بە ئەو هەموو گۆران کاری و لەدایک بونە نەدەبوو کە ئەمرۆ لە هەرێمی کوردستان چەندەها رۆژنامەی کوردی بە زمانی کوردی لەدایک بوونە وە رۆژانە لەدایک دەبن بۆ تۆمار کردنی روداوەکانی رۆژانەی کوردستان و بەئەرشیف کردنی کەلتوورو هونەرو فۆلکلۆری کوردی یان هەوالی کوردستان بگاتە هەموو مالێک ،، کورد جاران تەنها ئینساتی رۆژانەی هەبوو . یان رادیو رۆژنامە ئەمرۆ کارەکانی لەوە پێشکەوتووتر بوە وەکو چاو گرتن بەجارانی..پرۆگرامی ئەلەکترۆنی و تیڤی و رۆژنامەۆ گۆڤارو دروست کردنی ئەو مرۆڤانەی کە کاریان کردووە لەناو رۆژانەی رۆژنامەی کوردیدا بۆیە بەرز را گرتنی رۆژنامەگەری کوردی نمونەیەکی شارستانی یە.

***

# سنوورێکی دڕکاوی و سنورێکی پڕ لە ماڵ و گوڵ

## ئاشتی گەرمیانی .. هۆڵەندا

تەلە دڕکاویەکانی سنووری مەرزی گۆخلانی نزیک بە وولاتی کۆماری ئیسلامی ئێران چاڵی تیژیان لە ناو لەپمدا ماوە.. چاوەڕوانی بەر هەتاو .. خۆڵ و خاک بۆ پەرینەوەیەک .. تا قومە ئاوێک سەر لێومان تەر بکات..
ڕەشەبایەک کە دەم و چاو دەبرێت پاکەتە جگەرەو کارتۆنی بۆنی بسکیتی دەهێنا لەسەری نوسرابوو ساخت ایران . بچوو پایین ... دوور هێواش هێواش ... لا تقترب من الحدود ... ئەمانە پاشماوەی ئەو ڕۆژاگارانە بوون کە خەوەکانمان وورد ووردو جوان بوون بۆ باڵ گرتنێک کە کیشوەرەکانی دونیا ببرێت و کەس پێت نەڵێت تۆ بۆ کوێ دەڕۆییت .. وە چیت کوردی عەرەبیت یان فارسیت یان تورکیت یان ئەورووپیت .. تا لە ئاسیا بیت ئەم خەونانە ژێر چاڵن .. مرۆڤ بە وولاتی تەلی دڕکاوی ناو دەبات .. پاشماوەی ئاسەواری شەر بەردەوام لە وولاتەکەی مندا ماوە مرۆڤی ماندوو .. ئەو مرۆڤەی کە هیلاک و شەکەتی ئازادی سەردەمە .. ئاسەواری ئەو مرۆڤانەی کە تا ئێستا قوتابجانەی دیکتاتۆریەت لە ژیانیاندا ماوە.. وولاتێکی خاوەن کەشکۆڵ و ئەرشیف وولاتێک کەلە هەموو کیشوەرەکانی دونیا دەوڵەمەند ترە بۆ مێژوو بۆ کەلتوور بۆ پاشماوەی مرۆڤایەتی .. پۆستاڵ و سەردەمی عەسکەریەت تا ئێستا لەژیانی ڕۆژانەی ئەو میللەتەیە . هەمان سات هەمان کات هەمان چرکە ئەگەر مرۆڤ سەردانی ئەم قوتبە بکات سنوور مانایەکی تری هەیە .. سرووشت مانایەکی تری هەیە .. لەزۆر بەرنامەو کەناڵی میدیایی ئەورووپی باس لە 50 ساڵ پێش ئێستا دەکەن کە پاشماوەی ئاسەواری شەری جیهانی دووەم جار بە جار دەبینرێتەوە وەکو پاشماوەی یادوەری یەک وە پاراستنی و هەڵ گرتنی لەلایەن دەزگای ئاسەواری سەربازی یەوە وێنەی دەگیرێت و بە مێژوو وکورتەباسێک پارێزگاری لێ دەکرێت. یان زۆر جار لە دروست کردنی خانوو بەرەدا پارچەی تۆپ و گوللە و ئاسنی شەر دەدۆزرێتەوە بەتایبەت لە سنووری نێوان هۆڵەنداو ئەلمانیا.
لە سنوری ئەورووپای ڕۆژئاوادا بەهیچ شێوەیەک تەلی دڕکاوی نابینیت کە دەربرین لە سنوور بکات تا دارو گوڵ و باخچەکان ماڵەکان تێکەڵ بەیەکتر بوونە ... نموونەیەک 3 کم لەدووری ماڵەکەمەوە سنووری وولاتی بەلجیایە کە دوا ماڵی هۆلەندی لەگەڵماڵێکی

بەلجیکی دراوسێن ، لەهەندێک لاوە باخچەکان تێکەلە لەهەندێکی ترەوە ماڵەکان تێکەڵە.
زۆر جار مرۆڤ بە ئالاکە جیایان دەکاتەوە هەندێک جاری تر بە نوسینی ناوی وولاتەکە.. ئەمانە جیاکەرەوەی دوو ولاتن بە گول و باخچەو دارستان و شەقام و دراوسێ ... جوانی سروشت و ئاوەدان کردنەوەی بە دار چاندن و بریاری برینەوەی دار بە رەزامەندی پارێزگاو هەر خەڵک خۆی ئاگاداری دەزگاکان دەکاتەوە کە فلان دار دەبرێت.. ئەمەش جەزاکەی لە 200 دۆلار پترە، خۆشەویستی وولات بەرانبەر بە ئاگاداری لە دەسکەوتەکانی بەشێوەیەکی تر وای کردووە کە هوشیاری خەڵک لە ئەوروپا رۆژ بەرۆژ لەبەرەو پێش چوون دا بێت . دانانی رێ نمایی دەزگای هاتوو چۆ و بەلەدیە یان لەلایەن پارێزگاوە بۆ جێگای یاری منداڵ و پەرینەوەو ئاسان کردنی ژیان لەرێگای هێما مانابەخشەکان وای کردووە گەیشتن بەهەر شتێک ئاسان بێت .. لەم وولاتە ژیان ئاسان بۆتەوە .. گوێ گرتن لە بچووک و گەورە لە ئاکامی داهێنانەکانیان وە دروست کردنی ئەو داهێنانە بۆ کەرەستەو پێداویستی خزمەتی مرۆڤایەتی نەک بۆ ویران کردنی.
ئەگەر جەزا کردن لەئەوروپا نەمێنێت من بێگومانم کە ئەم وولاتەش وەکو ئاسیا کەم یاسا دەبێت. جەزاکردنێک کە هەموو کەس مل کەچی یاسایە. جەزا کردنێک کە رەنگ دانەوەی ئەوەی هەیە ئیدی کەس کاری خراپ نەکات .. جەزا کردن بۆ هەموو شتێک ... پەنابەران و کۆچ بەران بەشێوەیەکی رۆمانسی دەژین لەم وولاتانە خەونەکان وان کە وولاتانی ئێمەش وابن یان وا دەبن یان..... بەلام بێ سنووری نێوان وولاتەکان وای کردووە کە خەونەکانی سنووری گۆخلان ئەمرۆ راست بن ،، نەگوێت لە بچو پاین و دورر و لا تقترب دەبێت... سنوورێک لە گوول بۆ کوردستان ..

***

## به میزاجی خۆمان داوەتیان دەکەین بۆ کوردستان.........

**ئاشتی گەرمیانی**

هەروەک لە وەزارەتی رۆشنبیری راوێژکارێکی هونەری ئەمـــــەی یەکلا کردەوە کە پلانێکی راستەو خۆی سالانە نی یەبۆ داوەت کردنی هونـەرمەندانی کورد لە دەرەوەی وولات تەنها شێوەیەکی میزاجی یە.
من ئەم خالە زۆر بە گرنگی لە قەلام دەدەم کەوەزارەت هـیچ پلانێکی سالانەی نەبێت بۆ کار کردنی لە وەزارەتێک کە تەنها دەوام کردن بیـت.یان بەخزمایەتی خەلکانیک لە ناو بەرێوبەرایەتی یەکان وەرگیراون نمونەش ووتـەکەی بەرێز سەرۆکی حکومەتە کە ئاماژەی بەوە دا موەزەفێکی زۆرو زۆر لە هەرێمی کوردســـتان مەعاش وەر دەگرن.. بەراستی ئەوەی ئەنجام دەدرێت لە کوردستاندا زۆر کـــەم و لاوازە لە چاو ئەوەی کە وەردەگیرێت..خزمایەتی رێگای زۆری گرتوە کە مرۆڤ نەتــــوانێت ئیدی هیچ شتێک پێش کەش بکات.زۆر پێویستە ئەم دام و دەزگایانە بەخۆیان بچنەوە بۆ خــــزمەت کردنی وولاتەکەمان .نەک تەنها کارەکان لە چەند شتـــــــــــێکدا کۆ بێتەوە. من باس لەیەک لا دەکەم ئەویـــــــــش بەرز کردنەوەی چەند کەسانی تر کە ئەمە هیچ خزمەتێک بە رەوشی هونـــــــەری کوردی ناکات نە ئەمرۆ وە نە سبەینێش...
لەوە دەچێت گازندەی هونەرمەنـــدان ووردە ووردە سەر هەل بدات هەر وەک گوێمان لـە هونەرمەند ئەردەلان بـــــەکر بوو لە کەنالی کوردسات وە هونەرمەند نەریمان شتێک مەکەن دەست کـــــەوتی کەلتووری کوردی یاخی بێت لە سەردەمەکەی خۆیدا با ئەم نەخۆشـــــی یە بەشێوەیەک سەر هەل نەدات زۆرینەی هونەرمەندان بتۆرێن.. سەرەتایی ئەو نەخۆشی یەش ئەو دوو دەزگـــا هونەری یە یە کە تا ئێستا وەکو ئاستی پێوـــــست هونەرێکی زیندوویان پێشـــــــکەش بە کوردستان نەکردوە. یەکێتی و سەنــــــدیکا لە ناو نوسینە کۆنە کان دەکەن کە تەنها پارە دەدەن و هیچی تر..ئەوە کاری بەرێز کــــاک فەلەکەدین کاکەیی بووە کە بەرێزیان وەکو وەزیرێک لەو کەم و کوری یە بکۆلێتەوە ..چونـــکە وە نەبێت کەسان و پسپۆران و هونەرمەنان لە دەرەوەی وولات بێ ئاگـــــا بن لەم کەم و کوریانە وە وێنەیەکی جوانی نابێت بۆ سیمایی کوردستان.
بۆیە با وەزارەتەکان بەرنامەیەکی توندو راستو ستراتیژیان هەبێت دوور بێت لە خزمایەتی ئەم سەردەمە........وە هونەرمەندان وەکو یــــــەک مافی کاریان بۆ دابین

بکرێت نەک بە میزاجی چەنـــــــد کەسێک چونکە کوردستان بەو هەموو خەباتەوە گەورەترە بۆ دروست کردنی کەشکۆلێکی هونەری یان بیبلۆگرافیایەک.

****

روون کردنەوەیەکی کۆتایی پەیامەکەم

زۆر بەخۆش حاڵی یەوە هەر دۆستێکی هونەرمەند یان هونەر دۆست ئەگەر دەیەوێت تابلۆی هونەرمەندێک وورد بکاتەوە یان تێروانینێکی لەسەر باس بکەین بۆ پرۆژەیەکی تر دەتوانێت وێنەو روون کردنەوە لەسەر ئەو هونەرمەندە بنوسێت وبۆم بنێرێت بەم ناو نیشان یان پەیوەندی تەلەفونی.

Shegani_66@hotmail.com

Tel 0031 (0) 165 546963

Shegani

Heulberg 69

4708 hl roosendaal

هەندێک لە بەرهەمەکانی هونەرمەندی شێوەکار ئاشتی گەرمیانی



